ئەڤ جۆرێ پەیڤان ب تنێ درستەییێدا بهێنە بکارئینان وناڤ و جهناڤ دگەلدا نەهێن دێ بنە ناڤ و ب ( ناڤێ کراو ) دهێنە نیاسین بۆ نموونە :

نامەکا نڤیسی گەهشتە دەستێ من ( نڤیسی هەڤالناڤێ کراوێ دارێژتیە )

نامە نووسراوەکەم بە دەست گەهشت ( نووسراو هەڤالناڤێ کراوێ دارێژتیە )

نووسراوەکەم بە دەست گەیشت ( نووسراو ناڤێ کراوە )

درستەیا ئێکێ و دوویێدا دیارکەرێ ناڤییە، لێ درستەیا سێیێدا ئەو پەیڤ دبیتە ( ناڤێ کراو ) وەك ناڤەکێ ئاسایی هاتییە بکارئینان، دیارە دڤی باریدا هەمی ئەرکێن ناڤی وەردگریت و تایبەتمەندییێن وی ژی وەردگریت.

دروستکرنا هەڤالناڤێ کراوێ دارێژتی.

١- هەڤالناڤێ کراوێ دارێژتی ژ چاوگێ تێپەڕ و تێنەپەڕ ب لادانا نوونا چاوگی و زێدەکرنا پاشگرێ ( ی ) دروست دبیت وەك :

نڤیسین نڤیس + ی = نڤیسی

خواندن خواند + ی = خواندی

کێلان کێلا + ی = کێلای

شکەستن شکەست + ی = شکەستی

سووتن سووت + ی = سووتی

٢- دزارێ کرمانجییا خوارێدا هەڤالناڤێ کراو ژ چاوگێ سادە و دارێژتییێ تێپەڕ دهێتە دروستکرن، ئەوژی دێ ( رەگێ کاری ) وەرگرین وپاش دێ ( راو ) یان ( رای ) بسەر ڤە بەردەین ئانکو ژ قەدێ چاوگێ بکەر نادیار وپاشگرێ ( و ) یان ( ی )ە وەك :

نووسین نووس نووسراو ( نووسرای )

هەڵواسین هەڵواس هەڵواسراو ( هەڵواسرای )

٣- دیسان دزارێ کرمانجیا خوارێدا هەڤالناڤێ کراو ژ چاوگێ تێنەپەڕ ناهێتە دروستکرن ( تنێ چاوگێن ئەلفی نەبن )، ئەڤ چاوگێن ئەلفی هەرچەندە تێنەپەڕژی بن بەلێ چونکی دپێکهاتنێدا مینا چاوگێ تێپەرێ نەدیارن کو هەمی دبنە چاوگێ ئەلفی

ئەڤجا دروستکرنا هەڤالناڤێ کراوێ داریژتی ژڤان چاوگێن ئەلفی یێن تێنەپەڕ، هەر دێ دەستووری وەرگرتنا وان ژ چاوگێ تێپەڕێ نەدیار بکارئینین، ئەوژی ب لادانا نوونا چاوگی و زێدەکرنا پاشگرێ ( و ) یان ( ی ) وەك:

| | | |
|---|---|---|
| سووتان | سووتا | سووتاو ( سووتای ) |
| برژان | برژا | برژاو ( برژای ) |
| لکان | لکا | لکاو ( لکای ) |

چاوگێن دی یێن تێنەپەڕ، ئەڤ جۆرێ هەڤالناڤێ ژێ ناهێتە دروستکرن تنێ هەڤالناڤێ بکەرێ داریژتی ژێ دهێتە دروستکرن. وەك دبابەتێ بەری نوکە دا هاتییە بەحسکرن.

٤- هندەك جارا دزارێ کرمانجیا خواریدا ژ چاوگێ تێپەڕ هەڤالناڤێ کراوێ داریژتی دروست دبیت، ئەو ژی ب وەرگرتنا قەدێ چاوگی و زێدەکرنا پاشگرێ ( ە ) وەك:

| | |
|---|---|
| کوشتن | کوشت + ە = کوشتە |
| بردن | برد + ە = بردە |
| هەلبژاردان | هەلبژارد + ە = هەلبژاردە. |

## ڕاهێنان ( ١ )

ژڤان چاوگان هەڤالناڤێ کراوێ داریژتی دروست بکە:

پێچان ، دانان ، شکاندن ، چەسپاندن

## ڕاهێنان ( ٢ )

هەڤالناڤێ کراوێ دارێژتی ژڤان رستەیان بینەدەر:

١-زەوی کێلڕاو بە بڕشتە.

٢-خەلکێ گوندان جەهێ نماندی ددەنە تەرش و کەوالێ خۆ.

٣-تشتێ فرۆشتی ناهێتە وەرگرتن.

٤-خوێندکارە بەخشراوەکان خەلات کران.

## ڕاهێنان ( ٣ )

هەڤالناڤێ کراوێ دارێژتی ژڤان چاوگان دروست بکە و درستەکێدا بکاربینە.

کێلان ، کڕاندن ، شکاندن ، خواردن ، نڤیسین.

## ڕاهێنان ( ٤ )

ڤان رستەیێن ل خوارێ شرۆڤەبکە:

١-گوشتێ بژارتی ب تامە.

٢-نامەکا نڤیسی گەهشتە من.

(وانەیا نەهێ)

## هەڤاڵناڤێ کراو
## هەڤاڵناڤێ کراوێ لێکدای

(أ)

١- جوتیارە ستەملێکراوەکە زۆر هەژارو کەم درامەتە.

- جوتیارێ ستەملێکری زۆر هەژارو کێم درامتە.

٢- مرۆڤی دلسووتاو پێویستی ب دلدانەوە هەیە.

- مرۆڤێ دلسووتی پێدڤی ب شیرەتکرنێیە.

٣- پرچی ڕەشداگیرساوی ئەم کچە نیشانەی لەش دروستییەتی.

٤- ئازادی دەستبڕاو (دەستبڕای) یەکێکە لە قوربانییانی ڕەفتاری چەوتی بەدکاران.

- ئازادێ دەستبڕی ئێکە ژ قوربانیێن ڕەفتارا دوژمنکارانە.

٥- دوژمنی تەنگ پێهەلچینراو ناچاربوو خۆی بدا بەدەستەوە.

٦- پیاو نابێ دوای کڵاوی بابردوو بکەوێت.

(ب)

١- پێویستە چاودێری دڵسووتاو ماڵڕمادانی کارەساتی ئەنفال و بە عەرەب کردنی کەرکووك و گەرمیان بکەین.

- پێدڤییە چاڤدێریا دڵسووتی و ماڵ وێرانکرییێن کارەساتا ئەنفال و عەرەب کرنا کەرکووك و گەرمیان بکەین.

٢- بەشخوراوان داوای مافەکانی خۆیان دەکەن.

- تەپە سەرکری داخوازا مافێن خۆ دکەن.

٣- تەنگ پێهە ڵچنراوان بەزووترین کات خۆیان بە دەستەوە دەدەن.

٤-بەکرێگیراوان،تەمەنیان لە ناپاکیبەرامبەر بە گەلەکەیان بەسەر دەبەن.

- کرێگرتی ژیێ خۆ ب پەشێمانی دگەل مللەتێ خۆ دبۆرینن.

## بەرچاڤکرن:

هەڤاڵناڤێ کراوێ لێکدای، ئەوە کو کریارەك بسەردا هاتییە، کریار ژی وەك بەری نوکە د بەحسێ هەڤاڵناڤێ کراوێ دارێژتی دا مە ئاماژە پێ دای، بۆ وی بوویە سیفەتەکا هەردەم، بەلێ بکەرێ کریارێ دیارنینەو نزانین کییە یان چییە.

ئـ-

١-درستەیا (١)دا کۆمەلا رستەیێن (أ)، پەیڤا (ستەملێکراو) د زارێ کرمانجییا خوارێدا کو سیفەتەکا هەردەم دایە جوتیاری و ژناڤەکی و قەدێ چاوگێ نادیار (لێکرا) و پاشگرێ (و) دروستبوویە یان ب رامانەکا دی ئەم دشێین بێژین ژ ناڤەکی و رەگێ کارێ چاوگێ لێکردن و پاشگرێ (راو) دروستبوویە. هەر درستەیا ئێکێدا پشکا دووێ پەیڤا (ستەملێکری) د زارێ کرمانجیا ژووریدا کو سیفەتەکا هەردەم دایە جوتیاری ناڤەکی و قەدێ چاوگێ لێکرن و پاشگرێ (ی) دروستبوویە.

٢-هەر دوێ کۆمەلا رستەیاندا هەکە سەحکەینە رستەیا دووێ دێ بینین پەیڤا (دڵسووتاو-دڵسووتی)مە وەسفا ناڤێ (مرۆڤ) پێ کرییە.
ئەڤە بوویە سیفەتەکا هەردەم و جۆرێ دروستکرنا وان ژی پێکهاتیە ژ ناڤەکی و قەدێ چاوگێ تێنەپەر (سووتان-سووتن) وپاشگرێ (و-ی).

٣- هەر ب وی شێوێ سەری رستەیا سێیێ پەیڤەك تێدایە کو سیفەتەکا هەردەم ددەتە پەیڤا وەسفکری و خۆ وەك ناڤەکێ گشتی نیشاددەت. ئەڤ پەیڤە دبیتە هەڤاڵناڤێ کراوێ لێکدای و لپەی دەستوورەکێ تایبەت دروستبوویە. ئەو پەیڤ ژی (رەشداگیرساو) کو وەسفا ناڤێ (پرچ) دکەت وبوویە سیفەتەکا هەردەم بۆ وێ، ئەڤ هەڤاڵناڤێ کراو (بەرکارە)، لێکدانا وی ژی ژ هەڤاڵناڤەکێ قەدێ چاوگێ دارێژتیێ تێنەپەرێ ئەلفی (داگیرسان) و پاشگرێ (و) دروستبوویە.

هەروەسا درستەیێن دیژیدا (دەستبڕاو، دەستبڕی، تەنگ پێهەڵچنراو، بابردوو) هەڤاڵناڤێن کراوێ لێکداینە.

ب-هەکە ل کۆمەڵا رستەیێن ژمارە (ب) بنێڕین دێ بینین د هەر ئێك ژوان رستەیاندا پەیڤەك یان پتر هەیە کو ب رەنگێ وان پەیڤا هاتینە دروستکرن ئەوێن بەری نوکە مە بەحسکرین. بەلێ چونکی ناڤەك یان جهناڤەك ل پێشیا وان نەهاتییە وئەو پەیڤ نەبوویە سیفەت بۆ پەیڤا دی، ژبەر وێ چەندێ ئەم نەشێین ب ناڤێ (هەڤاڵناڤێ کراوێ لێکدای) ناڤکەین. بۆ

**نموونە :**

- درستەیا ئێکێ دا ژڤێ کۆمەڵێ هەردوو پەیڤێن (دڵسووتاو - دڵسووتی) و (ماڵڕماو - مال وێرانکری) وەك ناڤەکی درستەیێدا هاتینە بکارئینان و ئەڤان هەردوو ناڤان ئەرکێ بەرکاری وەرگرتینە و د دروستبوونێدا ژ ناڤەکی و قەدێ چاوگی و پاشگرێ (و - ی) دروستبووینە. بەلێ نەبووینە سیفەتەکا هەردەم بۆ چ ناڤان یان جهناڤان. ژبەر وێ چەندێ

ئەم دشێین بێژینێ (ناڤێ کراو) و د دروستبوونێدا لێکداینە.
- هەر ب ڤی شێوەی درستەیا دووێ دا پەیڤا (بەشخۆراوان) دکرمانجییا خوارێدا ئەرکێ بکەری درستەییێدا وەرگرتیە و تایبەتمەندیا ناڤەکی پێڤەیە کو ئەوژی (کۆ)یە. وەسفا چ ناڤان یان جهناڤان ناکەت. تنێ ئەرکێ تایبەتێ ناڤی دبینیت. ژبەر وێ چەندێ دێ بێژینێ (ناڤێ کراو)، و لێکدایە ژی، چونکی ژ ناڤێ (بەش) و قەدێ چاوگێ نەدیارێ (خوارن) و پاشگرێ (و) دروستبوویە.
دیسان پشکا دووێ ژ رستەیا (٢) پەیڤا (تەپە سەرکری) دکرمانجیا ژووریدا ئەرکێ بکەری وەرگرتییە و وەسفا چ ناڤ و جهناڤان نەکرییە، تنێ ئەرکێ تایبەتێ ناڤی دبینیت. ژبەر وێ چەندێ دێ بێژینێ (ناڤێ کراو)، و یێ لێکدایە ژی. چونکی ژ گرێیا ناڤی (تەپەسەر) و قەدێ چاوگێ (کرن) وپاشگرێ (ی) دروستبوویە.
هەر ب وی رەنگی پەیڤێن (تەنگ پێهەڵچنراو، بەکرێگیراوان، کرێگرتی) ژی (ناڤێ کراو)ە نە، ولێکداینە ژی.

## دەستوور:

هەڤاڵناڤێ کراوێ لێکدای پەیڤەکە کریارەك بسەردا هاتییە، ئەڤ کریارە بۆ وی بوویە سیفەتەکا هەردەم، بەلێ نزانین کریار ژلایێ (کێ) یان (چ) بسەرداهاتییە، ئانکو بکەرێ کریارێ دیار نینە، دیارە هەڤاڵناڤێ کراوێ لێکدای وەسفا ناڤەکی یان جهناڤەکی دکەت کو ل پێشیا وی هاتییە. هەر دەمێ ئەو هەڤاڵناڤ بتنێ هاتە بکارئینان. ئانکو چ ناڤ یان جهناڤ دگەلدا نەهاتن دێ بیتە (ناڤێ کراو) ول وی دەمی وەك ناڤەکی درستەییێدا دهێتە بکارئینان.
هەڤاڵناڤێ کراوێ لێکدای یان (ناڤێ کراوێ لێکدای) ب زۆری ژ چاوگێ تێپەڕ دهێتە وەرگرتن، چونکی کارێ تێپەر بەرکاری وەردگریت، هەر چەندە ئەم دشێین ژ چاوگێ تێنەپەرێ ئەلفی ژی وەرگرین وەك بەری نوکە مە ئاماژە پێدای.

**دروستكرنا هەڤاڵناڤێ كراوێ لێكداى يان ( ناڤێ كراوێ لێكداى )**

ئەڤ جۆرە هەڤاڵناڤە ب زۆرى ژ چاوگێ تێپەر دهێتە دروستكرن، و ئەڤ دروستكرنە لپەى چەند بنەمايەكا دهێتە بجە ئينان وب رەنگێ ڤى ل خوارێ:

١- ناڤەك دگەل ( رەگێ كار ) و پاشگرێ ( راو ) يان ( راى )

| چاوگ | رەگ | پاشگر | هەڤاڵناڤێ كراو |
|---|---|---|---|
| سەرتاشين | سەرتاش | راو ( راى ) | سەرتاشراو - سەرتاشراى |

دكرمانجيا ژووريدا هەڤاڵناڤێ كراوێ لێكداى ژ ناڤەكى دگەل ( قەدێ چاوگى )ە و پاشگرێ ( ى ) دروست دبيت وەك:

| چاوگ | قەد | پاشگر | هەڤاڵناڤێ كراو |
|---|---|---|---|
| دلگرتن | دلگرت | ى | دلگرتى |

٢- ناڤەك يان هەڤاڵناڤەك دگەل قەدێ چاوگێ ئەلفى يێ تێنەپەڕ و پاشگرێ ( و ) يان ( ى ) وەك:

| چاوگ | قەد | هەڤاڵناڤێ كراو |
|---|---|---|
| رەش هەلگەڕان | رەش هەلگەڕا | رەش هەلگەڕاو ( رەش لگەڕاى ) |
| ماڵسووتان | ماڵسووتا | ماڵسووتاو ( ماڵسووتاى ) |

دكرمانجيا ژووريدا هەڤاڵناڤێ كراوێ لێكداى ژناڤەكى دگەل قەدێ چاوگى تێنەپەڕ و پاشگرێ ( ى ) دروست دبيت:

| چاوگ | قەد | هەڤاڵناڤێ كراو |
|---|---|---|
| دلسووتن | دلسووت | دلسووتى |

٣- ناڤ دگەل قەدێ چاوگێ تێپەر ( دالى و تائى و واوى ) وپاشگرێ ( وو ) يان ( ى ) وەك:

با + بردن = بابرد + وو ( ى ) ، ە ) بابردوو ( بابردى ، بابرد )

كۆچ + كردن = كۆچكرد + وو ( ى ) ، ە = كۆچكردوو ( كۆچكردى ، كۆچكردە )

لێ دكرمانجيا ژووريدا ناڤ دگەل قەدێ چاوگێ تێپەر و پاشگرێ ( ى )

سەر + ژێكرن = سەر ژێكر + ى = سەرژێكرى.

تێبینی: ژوان چاوگێن لێکدای کو ژ ناڤەکی و چاوگەکێ سادەیێ تێپەر پێك دهێن

ئەم دشێین هەڤالناڤێ بکەرێ لێکدای و هەڤالناڤێ کراوی لێکدای ژێ دروست بکەین.

بەلی هەکە مە بڤێت جۆرێ هەڤالناڤێ کراوێ لێکدای ژ هەڤالناڤێ بکەرێ لێکدای

جودا بکەین پێدڤییە:

سەحا پەیڤا (کار)ی بکەین، هەکە ئەو پەیڤ (بکەر) بوو، هەمی بێژە دێ بیتە

هەڤالناڤێ کراوێ لێکدای وەك

(گورگ خواردوو) یان (گورگ خوارده) کو لڤێرە گورگ (بکەر)ە، ژبەر وێ چەندێ

(گورگ خواردوو) یان (گورگ خوارده) دێ بیتە هەڤالناڤێ کراوێ لێکدای بەلێ هەکە

پەیڤا پێش کاری (بەرکار) بوو، هەمی بێژە دێ بیتە هەڤالناڤێ بکەرێ لێکدای،

ئانکو دێ بەروڤاژی ئێکدوو بن وەك: (گۆشت خواردوو) یان (گۆشت خوارده)، لڤێرە

پەیڤا (گۆشت) بەرکارە. ژبەر وێ چەندێ هەمی بێژە دێ بیتە هەڤالناڤێ بکەرێ

لێکدای وب رامانا وەك هەڤالناڤێ (گۆشت خۆر) لێ دهێت بۆ نموونە:

ئازادی گۆشت خواردوو هات.

بێژەیا (گۆشت خواردوو) دێ بیتە هەڤالناڤێ بکەرێ لێکدای و دێ وەسفا ناڤێ (ئازاد)ی

پێ کەین.

ئەڤجا لڤێرە هەردوو بێژەیێن (گۆشت خواردوو) و (گۆشت خۆر) هەڤالناڤێ بکەرێ

لێکداینە، جیاوازی دناڤبەرا واندا ئەوە کو:

| | |
|---|---|
| گوشت خواردوو | سیفەتەکا کاتی پێڤەیە |
| بەلێ: گۆشت خۆر | سیفەتەکا هەردەم ب خۆڤە دگریت. |

## ڕاهێنان (١)

ژڤان مالکێن هۆزانا چ هەڤاڵناڤێ کراوێ دارێژتی ولێکدای بکەڤتە بەر چاڤێت تە بینەدەر و شێوازێ دروستکرنا وان روون بکە:

١-گـــەر دەپـــرسی دادوگـریان و فوغـــانم بۆ چییە
راستە باوك مردەنیم ئەمما جگەر سووتاوی تۆم

(کوردی)

٢-گرتینە ب فەندا دەستێن مەمی
چـاڤ بەستی ئاڤێتن بنێ گەمی

(بدرخان سندی)

٣-دڵێ هێلا نەی عەشقی یــار نـــەبێ
بەتیـــری نـــازی برینـــدار نـــەبێ
کوشتەی دوو دیدەی پڕ خومارنەبێ
بەجامێ سەراب نە شئەی پێ نەدەی
خـــوایە ئـــەم دڵە دائیم پەستی کەی

(پیرەمێرد)

٤-قەلبێ شکەستی هووربکی
شـــوونا بریـنـــان کوور بکی

(جزیری)

٥-ئەسیـــری میحنەتی هیجرانی تـــۆم یاری وەفـــادارم
کوژراوی خەنجەری موژگانی تۆم مەحبووبی نازدارم

(ئەختەر کۆیی)

٦-بەشەستی زولف و رووی ماهی وەکو ماهی گرفتارم
گەهێ دلگەستەی مارم، گـەهێ جانخەستەی نـــارم

( حاجی کۆیی)

## ڕاهێنان ( ٢ )

بەرسڤا ڤان پرسیارا بدە:

١- بۆچی هەڤالناڤێ کراو ب زۆری ژوان چاوگان دهێتە دروستکرن کو تێپەڕن؟

٢- جیاوازی دناڤبەرا هەڤالناڤێ کراو و ناڤێ کراو (چ دارێژتی چ لێکدای) چییە؟

٣- چەوا هەڤالناڤێ کراوێ لێکدای و هەڤالناڤێ بکەرێ لێکدای ژ چاوگێن لێکدای کو ب ناڤەکی دەست پێدکەن دێ هێنە ژێك جوداکرن؟

٤- دزارێ کرمانجییا ژووری چەوا هەڤالناڤێ کراوێ دارێژتی دهێتە دروستکرن، ب نموونەڤە روون بکەن:

## ڕاهێنان ( ٣ )

ژ چاوگێ (کردن ، خواردن) هەڤالناڤێ بکەرێ لێکدای و هەڤالناڤێ کراوێ لێکدای دروست بکە؟ و درستەییێدا بکاربینە.

## ڕاهێنان ( ٤ )

جۆرو شێوەیێ دروستکرنا ڤان هەڤالێناڤێن ل خوارێ دیاربکە:

( ببەز -فرۆشراو -خوێندەوار -گەشبین -دەستکوژ -دەستکرد -مارگەستی ستەمبار -نەنووسراو -دلشکەستی)

## ڕاهێنان ( ٥ )

ڤان رستەیێن ل خوارێ شرۆڤەبکە.

١-زەڤیا کێلای نەفرۆشن.

٢-مارگەستی ژ وەریسی دترسیت.

٣-چیرۆکێکی هەلبژاردەم بەباشی خوێندەوە.

## ڕاهێنان ( ٦ )

جیاوازی دناڤبەرا هەردوو هەڤالناڤێن (گۆشت خواردوو) و (گۆشت خۆر) چییە؟

١-ژلایێ دروستبوونێڤە.

٢-ژلایێ مەبەستا بکارئینانێڤە.

(وانەیا دەهی)

## هەڤاڵکار

١- دوهی بەفر باری.

٢- وانەیا مە بلەز تمام بوو.

٣- ئازادی کەو دناڤ هێلینێدا گرت.

٤- پاوان پیچەك سووت.

### بەرچاڤکرن:

ئەگەر ئەم سەحکەینە ڕستەیێن سەری وب هویری ل کارێن وان بنێڕین دێ بینین:

-درستەیا ئێکێدا ئەم دشیاین بێژین (بەفر باری) بەلێ بۆ هندێ داسنوورەکی بۆ دەمی رویدانا کارێ ڕستەیێ دانین پەیڤا (دوهی) مە بکارئینایە ب وێ رێکێ ئەم شیاین رویدانا کاری و ڕامانێ ژی ب تمامی ئاشکرا بکەین.

-درستەیا دوویێدا مەڤیا چەوانیا وێ تمام بوونێ دەربێخین لەوا مە هەوارا خۆ گەهاندە بەر پەیڤا (بلەز) و مە سنوورەك بۆ رامانا کاری دانا.

-درستەیا سێیێدا بێژەیا (دناڤ هێلینێدا) هەڤالکارە، چونکی جهێ رویدانا کاری دیارکرییە و سنوورەك بۆ جهێ رویدانا کاری ب تمامی ئاشکرا کرییە لەوا دبێژنە ڤێ پەیڤی (هەڤالکارێ جهی).

-درستەیا چوارێدا پەیڤا (پیچەك) هەڤالکارە، چونکی وەسف و پەسنا کارێ (سووت) کرییە، هەڤالکارێ چەندییە چونکە ئەندازەیێ سووتنا پاوانی

بۆمە دەرئێخستییە، ئەگەر ئەڤ پەیڤە درستەیێدا نەبایە مە نەدزانی کو پاوان چەند سووتییە، ژبەر هندێ دبێژنە ڤێ پەیڤێ (هەڤاڵکارێ چەندی).

دەستوور:

**هەڤاڵکار/ پەیڤەکە رویەکێ رویدانا کارێ رستەیێ دەربارەی ( چەوانیا وێ رویدانێ یان دەمێ یان جهێ یان چەندییا ) رویدانێ دەردئێخیت و سنوورەکی بۆ تمامکرنا رامانا کارێ رستەیێ دادنیت.**

(وانەیا یازدێ)

## تمامکرنا کاری ب هەڤاڵکارێ دەمی ( کاتی )

**ڤان رستەیان بخوینە :**

- هەلەبجە ل شازدەی ئادارێ هاتییە کیمیا بارانکرن.
- شڤان ژمێژە نڤستییە.
- کوردستان ل سەدێ بیستێ جارەکا دی هاتییە دابەشکرن.
- گەلێ کورد ل پێنجێ ئادارێ ڕاپەڕی.
- هەڤال سوبەهی دێ ڤەگەڕێتە دهوکێ.
- کورد هەردەم دەست ژ ئازادیێ بەرنادەت.

**بەرچاڤکرن:**

دڤان رستەیێن سەریدا کار ب هەڤالکاری هاتینە تمامکرن، درستەیا ئێکێدا بێژەیا (ل شازدەی ئادارێ) دەمێ کیمیا بارانکرنا باژێرێ هەلەبجە نیشاددەت و دەردئێخیت، لەوا دبێژنێ هەڤالکارێ دەمی (کاتی) ودبیتە تمامکەرێ کارێ رستەیێ.

د ڕستەیا دووێدا پەیڤا (ژمێژە) دەمێ نڤستنا (شڤان)ی نیشاددەت و دەردئێخیت لەوا هەڤالکارێ دەمی یە و تمامکەرێ کارێ رستەیێیە.

د ڕستەیا سێیێدا بێژەیا (ل سەدێ بیستێ) دەمێ دابەشکرنا ولاتێ کوردستانێ بۆ جارەکادی دەست نیشان دکەت و دبیتە تمامکەرێ کارێ ڕستەیێ.

دڕستەیا چوارێدا پەیڤا (ل پێنجێ ئادار )ێ هەڤاڵکارە، بەلی چونکی دەمێ ڕاپەڕینا کوردان دەردئێخیت ژبەر هندێ هەڤاڵکارێ دەمی یە، و تمامکەرێ کارێ رستەیێیە.

دڕستەیا پێنجێدا پەیڤا (سوبەهی) دەمێ ڤەگەڕیانا (هەڤال)ی بۆ باژێرێ دهوکێ نیشاددەت، ژبەر هندێ هەڤالکارێ دەمی یە، تمامکەری کارێ رستەیێیە.

درستەیا شەشێدا پەیڤا (هەردەم) وێ چەندی دیاردکەت کو چ جاران کورد دەست ژ هزرا ئازادیێ بەرنادەت، ژبەر هندێ هەڤاڵکارێ دەمی یە، و تمامکەرێ کارێ رستەیێیە.

## دەستوور:

**هەڤاڵکارێ دەمی ئەو هەڤاڵکارە کو دەمێ رویدانا کارێ رستەیێ دەردئێخیت و نیشاددەت و دبیتە تمامکەرێ کارێ رستەیێ، چ ئەڤ کارە (بۆری بیت یان نە بۆری یان داخوازی) بیت، کارێ رستەیێ تێپەر یان تێنەپەر بیت هەروەسا دبیتە تمامکەرێ کارێ بێ هێز... بەرسڤا پرسیارا (کەی، کەنگی، لەکەیەوە، چ کاتێ، چ دەمی، ژ کەنگی وەرە....) ددەت، ئەڤە ژی هندەك ژ هەڤاڵکارێن دەمی نە (ئێستا، نوکە، ئەمرۆ، سوبەهی، پشتی نیڤرو، نهۆ، کەم، رۆژانەدا، چەند رۆژەکێن دی، بەم زووانە، بەهارێ، ئیرۆ، ئێڤاری، جاران، ئەمساڵ، لەمێژە، ژمێژە، هەندێ جار، هەمیشە، لەمەولا، تابەیانی، لەو ساوە، بەرێ، پێرێ، هەمی گاڤا، هەردەم، ژنهۆ پێڤە.......... هتد).**

**تێبینی:**

هەڤاڵکار کو دبیتە تامکەرێ کاری، نەدبیتە بەرکار و نەدبیتە تامکەرێ بەیاریدە، چونکە دبنیاتدا بۆ هندێیە کو دەمێ ڕویدانا کاری یان جهێ ڕویدانێ یان چەوانیا ڕویدانا کاری دەربێخیت... وەکو ئێك و ب ئێك شێوە دبیتە تامکەرێ کارێ تێپەڕ و تێنەپەڕ.

## ڕاهێنان (١)

دڤان دێڕێن هۆزاناندا هەڤاڵکاران دیاربکە و شرۆڤەبکە:

١-ئەو کولیکێن تا بەلاڤ

یێ ژبەر شەڤ بای دلڤن

ب شەڤێ لێ دکەڤیت خوناڤ

سپێدەهیا زوی دبشکڤن

٢-مخابن بۆ جهێ کوردان

نهۆ لێ بۆیە ئێڤار

هەتا ئەڤرۆ دخەودا مای

بسەرداهات شەڤا تاری

(نالبەند)

٣-ئەگەر چی شەو درەنگە ساقی بۆم تێکە کەمێکی تر

ئەوا ئەم شەو سەری هەڵدا لە ناخمدا خەمێکی تر

(هێمن)

## ڕاهێنان (٢)

هەڤالکارێن (ل ڤان نێزیکان -نوکە -ژ هینگێ وەرە) دڕستەیاندا بکاربینە ب مەرجەکی هەڤالکارێ ئێکێ و دووێ ببنە تمامکەرێ کارێ تێنەپەر و هەڤالکارێ سێیێ ببیتە تمامکەرێ کارێ تێپەر.

## ڕاهێنان (٣)

دڕستەیا (ئەڤرۆ دڤێت کوردستان ژ هەمی لایانڤە پێش بکەڤیت).

١-(ئەڤرۆ) چییە؟ ئەرکێ وێ چییە؟

٢-بکەرێ رستەیێ دیاربکە.

٣-(پێش بکەڤیت) چ جۆرەکارەکە؟ چەوا هاتییە دروست کرن؟

٤- رستەیێ بگهۆڕە بۆ سەر شێوەزارێ کرمانجییا خوارێ و سەر ژنوی رستەیێ بنڤیسە.

(وانەیا دوازدێ)

## تمامکرنا کاری ب هەڤالکارێ جهی (شوێنی)

**ڤان دێرێن هۆزانان بخوینە :**

١- لەژێـــر ئاسمـانی شـینـــا

لە پال لووتکەی بەفرینا

کـــوردستان گـــەڕام

دۆلاو دۆل پێــــــــوام

(گوران)

٢- تەحقیق مەلەک و یا پەری بـوون

لەورا کو ل ناڤ وگل پەری بوون.

(خانی)

٣- وەکی گورگی لناڤ بەرخا وەکی تەیری لسەر فەرخا

دائیم ددەت دەورو چەرخە شـــەڤ و رۆژ و مەه و ســـالە.

(نوره ددین بریفکانی)

٤- میری بادشـــاهی موویەک ل نـــک مـــەلایێ

نادەم ب مولکێ عالەم یەک زەڕە یەک عینایەت

(مەلایێ جزیری)

٥- دوهـــی سپێدی لســـەر بانی

من جانەک دیت ژ خەو ڕابوو

(نالبەند)

## بەرچاڤکرن:

دڤان نموونەیێن سەریدا هەمی کار ب هەڤاڵکاری هاتینە تمامکرن، دنموونەیا ئێکێدا پەیڤێن (لەژێر) و (لە پاڵ) جهێ رویدانا کارەکی دەردئێخن، لەوا دبنە هەڤاڵکارێ جهی و دبنە تمامکەرێ کاران.

-دنموونەیا دووێدا پەیڤا (ل ناف) جهێ رویدانا کارێ رستەیێ دەردئێخیت، لەورا هەڤالکارێ جهییە، و تمامکەرێ کارێ رستەیێیە.

- دنموونەیا سێیێدا پەیڤێن (لناف ، لسەر) جهێ ڕویدانا کارێ رستەیێ دەردئێخن، لەورا هەڤاڵکارێ جهی نە، دبنە تمامکەرێ کارێ ڕستەیێ.

-دنموونەیا چوارێدا پەیڤا (ل نك) جهێ رویدانا کارێ ڕستەیێ دەردئێخیت ودبیتە هەڤالکارێ جهی.

-دنموونەیا پێنجێدا پەیڤا (لسەر) هەڤاڵکارێ جهی یە و دبیتە تمامکەرێ کارێ ڕستەیێ . . .

## دەستوور:

**هەڤالکارێ جهی ئەو هەڤاڵکارە کو جهێ رویدانا کارێ رستەیێ نیشاددەت و دەردئێخیت، بەرسڤا پەیڤا پرسیارێ ( ل کیرێ، لە کوێ - لە کیندەرێ - بۆ کوێ ) ددەت.**

**ئەڤەژی چەندەکن ژ هەڤالکارێن جهێ ( سەر، ژێر، خوارێ، بن، لنك، پاش، پێش، ل ژێر، ل بەری، لسەرڤە، لناڤ، تەنشت، چەپ، راست، ل وێرێ، لڤێرە، ژ خوارێ، دناڤ، ژێری، ژووری، بنڕا، دناڤ شکەفتێدا، لسەرداری، لبن . . .هتد ).**

## ڕاهێنان ( ١ )

دڤان رستەیاندا هەڤالکاران دیاربکە و شرۆڤەبکە:

١-ڕۆژ ل رۆژهەلاتیڤە بلند دبیت.

٢-ئالایێ کوردستانێ لسەر گوپیتکا چیایان دشەکیت.

٣-شڤان ل خوارێ ڕوونشتییە.

٤-ل نك مرۆڤێ نەخۆش نەڕوینە.

٥-نەوزاد ژ خوارێ چوو سەری.

## ڕاهێنان ( ٢ )

ئەڤ هەڤالکارێن لخوارێ، چ جۆرن، درستەیاندا بکاربینە:

(ل جەم ، پار ، باکوور ، بەربانگ ، نیڤا شەڤ ، نوکە)

## ڕاهێنان ( ٣ )

نیڤا ئێکێ ژ ئەڤێ دێرە هۆزانا (گوران)ی شرۆڤەبکە:

لە باخچەی پاشادا ورد گەڕام خوارو ژوور

زەرد هەبوو، بۆم چنیت، چنگ نەکەوت گوڵی سوور

## ڕاهێنان ( ٤ )

پارچە پەخشانەکێ لسەر هێرشێن نەمرۆڤانە یێن ئەنفالێ بنڤیسە، بۆ سەر هەمی دەڤەرێن کوردستانا عێراقێ ل سالا ١٩٨٨، پاشی هەڤالکارێن جهی دیاربکە.

(وانەیا سێزدێ)

## تمامكرنا كاری ب هەڤاڵكارێ چەوایی

ئەڤان نموونەیان بخوینە :

١- ئەم ڕۆژیساڵی تازەیە نەورۆزە هـاتەوە

جەژنێكی كۆنی كوردە بە خۆشی و بەهاتەوە

(پیرەمێرد)

٢-دیــــلانێ هـــۆزان جـــوان خـــواند.

٣- جوتیاری فێقیێ خۆ ب ئەرزانی فرۆشت.

٤- هەڤـــال ب دلگەشی چـــوویە مـــاڵ.

٥- ئەڤ دارشتنە باش هاتییە نڤیسین.

**بەرچاڤكرن:**

دڤان نموونەیێن سەریدا كارێن وان ب هەڤاڵكارەكی هاتینە تمامكرن، دنموونەیا ئێكێدا پەیڤا (بەخۆشی) چەوانیا هاتنا جەژنا نەورۆزا كوردان دیاردكەت، لەورا هەڤاڵكارێ چەواییە، و تمامكەرێ كارێ رستەیێیە.

دنموونەیا دوویێدا پەیڤا (جوان) چەواییا رویدانا کارێ خواندنێ نیشاددەت، لەورا هەڤاڵکاری چەوایییە، و تمامکەرێ کارێ رستەییێیە.
دنموونەیا سێییێدا پەیڤا (ب ئەرزانی) چەواییا فرۆشتنا فێقی دیاردکەت، لەورا هەڤالکارێ چەوایییە، و تمامکەرێ کارێ رستەییێیە.
دنموونەیا چوارێدا پەیڤا (ب دلگەشی) چەوانیا چوونا هەڤالی نیشاددەت بۆ مالێ، لەورا هەڤاڵکارێ چەوایییە، و تمامکەرێ کارێ رستەییێیە.
دنموونەیا پێنجێدا پەیڤا ( باش) چەوانیا نڤیسینا دارشتنێ دەردئێخیت، لەورا هەڤالکارێ چەوایییە، و تمامکەرێ کارێ رستەییێیە.

**دەستوور:**

**هەڤاڵکاری چەوایی ئەو هەڤاڵکار کو چەواییا ڕویدانا کارێ رستەیێ نیشان ددەت و وەسفا کارێ رستەیێ دکەت.**
**بەرسڤا پەیڤا پرسێ ( چەوا ، کوو ، چەوان ، چۆن ) ددەت و ئەڤ پەیڤە ژێ چەند نموونەیەکن ژ هەڤاڵکارێ چەوایی:**
**( شێرانە، ئازایانە، مەردانە، ژیرانە، ب نەخۆشی، ب تورەیی، دەم دەمی، پشت و پشت، ب باشی، ب خۆشی، مێرانە، ب پاکی، ب پاقژی، ب لەز....هتد ).**

**تێبینی:**

هندەك پەیڤ هەنە ئەگەر درستەییێدا وەسفا ناڤەکی یان جهناڤەکی بکەن، ببنە هینگێ دێ بنە هەڤالناڤێ چەوایی وەکی:

( جوان، باش، خراپ، ڕێك، بەرز، چاك، توند، بلند . . . . هتد ) وەکی:

نمرە ییێن من دباش بوون.

نمرەیەکا باش ل کوردیێ وەرگرتییە.

وان باخچەیەکێ جوان یێ هەی.

چیاییێن دەڤەرا هەوە بلندن.

درستەییێن سەریدا پەیڤێن (باش، جوان، بلند) هەڤالناڤێن چەوایینە چونکی وەسفا ناڤان دکەت درستەییێدا ودبنە دیارکەرێن ناڤی تمامکەرێ کارێ بێهێز.

. . بەلێ ئەگەر ئەڤ پەیڤە وەسفا کارەکێ تمام بکەن درستەییێدا هینگێ دێ بنە هەڤالکارێن چەوایی و دێ بنە تمامکەرێ کارێ رستەیێ وەکو:

من وانە ب باشی خواند

باخچەیێ وان جوان چاند بوو

چالاکییێن هەمە بلند هاتنە هەلسەنگاندن.

بەلێ دڤان رستەییێن سەریدا پەیڤێن (باش، جوان، بلند) چونکو وەسفا کارێ رستەیان دکەن وچەوانیا ڕویدانا کارێن وان نیشاددەت، لەورا دبنە هەڤالکارێن چەوایی، ودبنە تمامکەرێ کارێ رستەیێ.

## ڕاهێنان ( ١ )

دڤان رستەیاندا ئەو پەیڤێن هێل ل ژێر هەی شرۆڤەبکە:

١-کوردستان ب دلڕەقی هاتبوو وێرانکرن.

٢-گەلێ کورد شێرانە ڕاپەڕی.

٣-گول ب جوانی هاتنە چاندن.

٤-ئەم ب تەڤایی شولێ خۆ دکەین.

٥-هەڤالێن لەزگینی ب لەز هاتن.

## ڕاهێنان ( ٢ )

ڤان پەیڤان دڕستەیاندا بکاربینە ب مەرجەکی جارەکێ ببنە هەڤاڵناڤ و جارەکا دی ببنە هەڤاڵکارێ چەوایی:

( ١-خراپ ٢-چاك ٣-جوان ٤-باش ٥-بلند)

## ڕاهێنان ( ٣ )

ڤان ڕستەیێن خوارێ شرۆڤەبکە:

١-مەلەڤان ئازایانە ل ڕوبیاری دەرباز بوو.

٢-فراڤینێ ب گەرمی بخۆ.

٣-نێچیرڤان ب سیاری چوون بۆ نێچیرێ.

## ڕاهێنان (٤)

هەڤاڵکاران دڤان نموونەیێن خوارێدا دیاربکە و جۆرێن وان دەست نیشان بکە:-

١-لسەر پشتا تە حەرب و هنگ و دنگە
تو پرت پرت بووی وەکی داری بمشاری

(نالبەند)

٢-تێم و دچم دەشت و شاخ
دەرباز دکم دەم و چاخ
بەر سێبەر و هەتاڤا
سەر نەفەل و بەراڤا

(سەبری بۆتانی)

٣-گەلۆ بۆچی ئەڤ ژیان
تەڤ بوویە ژان و زیان
کەسێ باشە، ل پاشە
ل پێش وی ڕێك و کاشە

(سەبری بۆتانی)

٤-مەی هاتە فینجانا ل دەف کەس دێ ڤەخۆت ئیرۆ ب خەف
ساقی ب چەنگ و نای و دەف فەرفوری یا مەهتاب دا

(جزیری)

٥-شاعر و بلبل ونێرگز..
هەمی دەما..
رك و داڤێن لێ بووینە دز

(موئەیەد تەیب)

(وانەیا چواردێ)

## تمامکرنا کاری ب

## هەڤاڵکارێ رێکخستن

١- سیار دەستە دەستە دهاتن.

٢- باران تاڤ تاڤ دباریت.

٣- گەنج کۆم کۆم ڕاوەستیابوون.

٤- ئەم هەوە جارجار دبینین.

٥- هەڤالان سێڤ کت کت خوارن.

٦- ئەو ئاڤێ فرفڕ ڤەدخۆت.

٧- پێشمەرگە پۆل پۆل گەهشتنە جهێ خۆ.

٨- کەو بڕبڕ فڕین.

٩- کوتران جووت جووت دادان.

١٠- زارۆ سێ سێ چوون.

**بەرچاڤکرن:**

ئەگەر بەرێ خۆ بدەینە ڕستەیێن سەری دێ بینین پەیڤێن (دەستە دەستە، تاڤ تاڤ، کۆم کۆم، جار جار، کت کت، فرفڕ، پۆل پۆل، بڕبڕ، جووت جووت، سێ سێ) رێکخستن و رێزبەندی تێدایە، دبێژنە وانا هەڤاڵکارێن رێکخستنێ چونکی:-

١-درستەیا ئێکێدا پەیڤا (دەستە دەستە) هەڤاڵکارێ ڕێکخستنێیە، چونکە کارێ (دهات) تمامکرییە، و شێوەیێ ڕویدانا کاری دەرئێخستییە، ئەگەر پەیڤا (دەستە دەستە) نەبایە مە نەدزانی کا کارێ رستەیێ ب چ شێوەیەکی ڕویدایە.

٢-درستەیا دووێدا پەیڤا (تاڤ تاڤ) هەڤاڵکارێ ڕێکخستنێیە، چونکی ڕامانا کارێ (دباریت) تمام دکەت، وشێوەیێ ڕویدانا کارێ رستەیێ دەردئێخیت، ئەگەر پەیڤا (تاڤ تاڤ) نەبیت درستەییێدا ئەم نزانین کار ب چ شێوەیەکی ڕویددەت.

٣- درستەیا سێیێدا پەیڤا (کۆم کۆم) هەڤاڵکارێ ڕێکخستنێیە، چونکی شێوەیێ ڕویدانا کارێ (ڕاوەستیا بوو) دەرئێخستییە و ڕامانا کاری ژی تمامکرییە، ئەگەر پەیڤا (کۆم کۆم) نەبایە مەنە دزانی کارێ رستەیێ ب چ شێوە رویدایە.

٤- درستەیا چوارێدا پەیڤا (جار جار) هەڤاڵکارێ ڕێکخستنێیە، چونکی شێوەیێ ڕویدانا کارێ (دبینین) دەردئێخیت و رامانا کاری ژی تمام دکەت، ئەگەر پەیڤا (جار جار) درستەییێدا نەبیت ئەم نزانین کارێ رستەیێ ب چ شێوەیەکی رویددەت.

٥- درستەیا پێنجێدا پەیڤا (کت کت) هەڤاڵکارێ ڕێکخستنێیە، چونکی شێوەیێ ڕویدانا کارێ (خوارن) دەرئێخستییە و رامانا وێ ژی تمامکرییە، ئەگەر پەیڤا (کت کت) نەبایە مە نەدزانی کو کارێ رستەیێ ب چ شێوەیەکی ڕویدایە.

٦-درستەیا شەشێدا پەیڤا (فڕفڕ) هەڤاڵکارێ رێکخستنێیە، چونکی شێوەیێ ڕویدانا کارێ (ڤەدخۆت) دەردئێخیت وڕامانا کاری ژی تەمامدکەت، ئەگەر پەیڤا (فڕفڕ) درستەییێدا نەبیت، ئەم نزانین کارێ رستەیێ ب چ شێوەیەکی رویددەت.

٧- درستەیا حەفتێدا پەیڤا (پۆل پۆل) هەڤاڵکارێ رێکخستنێیە، چونکی شێوەیێ ڕویدانا کارێ (گەهشت) دەردئێخیت وڕامانا کاری ژی تەمامکرییە ئەگەر پەیڤا (پۆل پۆل) نەبایە، مە نەدزانی کارێ رستەیێ ب چ شێوەیەکی ڕویدایە.

٨- درستەیا هەشتێدا پەیڤا (بڕبڕ) هەڤاڵکارێ رێکخستنێیە، چونکی شێوەیێ ڕویدانا کارێ (فڕی) دەرئێخستییە، و ڕامانا کارێ رستەیێ تەمامکرییە، ئەگەر پەیڤا (بڕبڕ) نەبایە، مە نەدزانی کارێ رستەیێ ب چ شێوەیەکی ڕویدایە.

٩- درستەیا نەهێدا پەیڤا (جووت جووت) هەڤاڵکارێ رێکخستنێیە، چونکی شێوەیێ ڕویدانا کارێ (دادا) دەرئێخستییە، و ڕامانا کارێ رستەیێ تەمامکرییە، ئەگەر پەیڤا (جوت جوت) نەبایە، مە نەدزانی کارێ رستەیێ ب چ شێوەیەکی ڕویدایە.

١٠- درستەیا دەهێدا پەیڤا (سێ سێ) هەڤاڵکارێ رێکخستنێیە، چونکی شێوەیێ ڕویدانا کارێ (چوون) دەرئێخستییە، و ڕامانا کارێ رستەیێ تەمامکرییە، ئەگەر پەیڤا (سێ سێ) نەبایە، مە نەدزانی کا کارێ رستەیێ ب چ شێوەیەکی ڕویدایە.

## دەستوور:

**هەڤاڵکارێ رێکخستنێ: ئەو هەڤاڵکارە کو درستەییێدا شێوەیێ رێکخستنا ڕویدانا کارێ رستەیێ دەردئێخیت، و ڕامانا وی ژی تمام دکەت وهەمی گاڤا دبیتە تمامکەرێ کاری درستەییێدا، وەکو:**

**(دەستە دەستە، پۆل پۆل، جار جار، بڕ بڕ، جوان جوان، کۆم کۆم، سێ سێ، شەش شەش . . . )**

## ڕاهێنان (١)

ڤان هەڤاڵکارێن رێکخستنێ درستەیاندا بکاربینە:-

(دەم دەم -گاف گاف -هێدی هێدی -خێرا خێرا -بڕ بڕ -دەستە دەستە -چوار چوار -جوان جوان )

## ڕاهێنان (٢)

((خەلکێ گوندان کۆم کۆم ل سپێدەهیا رۆژا جەژنێ ل ماڵان دگەڕیان و جەژن پیرۆزدکرن.))

بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:

١-پەیڤا (کۆم کۆم) چییە؟ ئەرکێ وێ چییە؟

٢-بکەرێ رستەیێ شرۆڤەبکە.

٣-پەیڤا (جەژن) یا خیت لبن شرۆڤەبکە.

٤- دوو کار دپارچا سەریدا هەنە، بینە دەرێ، ودیاربکە کانێ تێپەڕن یان تێنەپەڕن.

## ڕاهێنان ( ٣ )

ڤان رستەیێن خوارێ شرۆڤەبکە:

١-دوهی قوتابی کۆم کۆم بلەز هاتنە خاندنگەهێ.

٢-یاریزان دوو دوو دچنە مەشقێ.

## ڕاهێنان ( ٤ )

ڤان پرسیارێن ل خوارێ ب هەڤالکارێ رێکخستنێ بەرسڤ بدە:

١-مێڤان چاوان دهاتن؟

٢-گەنم چەوا هاتیە دروین؟

٣-یاریکەر چەوا یاریێ دکەن؟

٤-شیلانێ ئاڤ چەوا ڤەدخوار؟

(وانەیا پازدێ)

## تمامکرنا کاری ب
## هەڤالکارێ چەندی

١- من دلبـــەرەک وەک دوڕ هەیـە

مەحبوب شیـــرین ســـــوڕ هەیـە

حوسن و جەمـــالەک پور هەیـە

بەلقیس سیفەت مەسکەن سەبا

(جزیری)

٢- هەتاوی نەورۆز مانگی جۆدرەو

زۆر هـاتن و چوون بەڕۆژ و شـەو

(گۆران)

٣- قوتابیێ دەرنەچووی پیچەک دخواند.

(گۆران)

٤- ئـو تو بەنــدەبی زمـان لالۆمــە

بەلێ فەعم دکەم ئەز ژ روحێ تە

بەلێ کێم دبهێم خەبەرێ تەدوور

حەزنا فیکرانە، بەحرا بێ بوحوور

(جاسمێ جەلیل)

٥- منداڵەکە تۆزێک یاری دەکات.

٦- نارینێ چیرۆک گەلەک بەلاڤە دکرن.

## بەرچاڤکرن:

ئەگەر بەرێ خۆ بدەینە ڤان نموونەیان دێ بینین:

١- ددێرا هۆزانا ئێکێدا پەیڤا (پوڕ) پڕ هەڤاڵکارێ چەندییە، وتمامکەرێ کارێ (هەیە)یە، چونکی چەندایەتیا رویدانا کارێ (هەیە) دەردئێخیت.

٢- ل دێرا هۆزانا دووێدا پەیڤا (زۆر) هەڤاڵکارێ چەندییە، وتمامکەرێ کارێ (هات ، چوو)یە ، چونکی چەندایەتیا ڕویدانا کارێ وێ دەرئێخستییە.

٣- درستەیا ژمارە سێدا پەیڤا (پیچەك) هەڤاڵکارێ چەندییە، وتمامکەرێ کارێ (دخواند)ە، چونکی چەندایەتیا ڕویدانا کارێ رستەیێ دەرئێخستییە.

٤- ددێرا هۆزانا چوارێدا پەیڤا (کێم) هەڤاڵکارێ چەندییە، وتمامکەرێ کارێ (دبهێم)ە، چونکی چەندایەتیا ڕویدانا کارێ رستەیێ دەردئێخیت.

٥-درستەیا ژمارە پێنجێدا پەیڤا (تۆزێك) هەڤاڵكارێ چەندییە، وتمامكەرێ كارێ(یاری دەكات)ە، چونكی چەندایەتیا ڕویدانا كارێ رستەیێ دەرئێخستییە.

٦-درستەیاژمارەشەشداپەیڤا(گەلەك)هەڤاڵكارێ چەندییە،وتمامكەرێ كارێ (بەلاڤەدكرن)ە، چونكی چەندایەتیا ڕویدانا كارێ رستەیێ دەرئێخستییە.

## دەستوور:

**هەڤاڵكارێ چەندی: ئەو هەڤاڵكارە درستەییێدا چەندایەتیا ڕویدانا كارێ تمام (تێپەڕو تێنەپەڕ) نیشاددەت، ودبیتە تمامكەرێ كارێ. هەڤاڵكارێن چەندی وەكی (زۆر، كەم، كێم، گەلەك، تۆزێ، هندەك، پیچەك، پوڕ( پڕ )، نەختێ، فرە . . . )**

## ڕاهێنان ( ١ )

ڤان هەڤاڵكارێن چەندی یێن ل خوارێ درستەیاندا بكاربینە ب مەرجەكی سێ ژوانا ببنە تمامكەرێ كارێ تێپەڕ، دوو ژوانا ببنە تمامكەرێ كارێ تێنەپەڕ:

(زۆر ، هندەك ، پیچەك ، گەلەك ، پڕ)

## ڕاهێنان ( ٢ )

دڕستەیا (سالاری هۆزان زۆر ژبەركرینە):

ئـ-(ی) پشتی پەیڤا (سالار) چییە ؟

ب-بکەرێ رستەیێ دیاربکە.

پ-پەیڤا (زۆر) چ جۆرە هەڤالکارەکە؟ ئەرکێ وێ چییە؟

ج-بەرکارێ رستەیێ بینە دەرێ.

ح-کارێ (ژبەرکرینە) ب چەند جۆرێن هەڤالکارێن دی دشێت بهێتە تمام کرن؟ ب نموونەڤە نیشابدە.

## ڕاهێنان (٣)

کارێن ئەڤان رستەیان ب هەڤالکارەکێ چەندی تمام بکە:

١-ئەلەند دوهی بەزی.

٢-زاڕوکی ئاڤ ڤەخوار.

٣-نەخۆش دکوخیت.

٤-کەو یێ دخوینیت.

٥-تێشت یا سار بووی.

## ڕاهێنان (٤)

ڤان هەڤالکاران دڕستەیاندا بکاربینە و جۆرێن وان نیشابدە:

(هەردەم ، گەلێ ، بەخێرایی ، پێرار ، دەم دەم ، تیپ تیپ ، لناڤەراست).

(وانەیا شازدێ)

## ئەركێ هەڤاڵكارى دڕستەییێدا

١- پار چووین بۆ دهوكێ.

٢- ئاڤ گەلەك زوو كەلی.

٣- پێلاوەكەم بەپەلە لەپێ كرد.

٤- مە ماسی دناڤ گۆمێدا گرتن.

**بەرچاڤكرن:**

مەزانی كو هەڤاڵكار ئەو پەیڤە كو سنوورەكی بۆ ڕویدانا ڕامانا كارێ دناڤ ڕستەییێدا دادنیت و روویەكێ ڕویدانا وی كاری ئاشكرا دكەت، دبیتە تەمامكەرێ ڕامانا رستەییێ.

دڤێرەدا مە دڤێت ئەركێ هەڤاڵكارى دناڤ رستەییێدا بەرچاڤ بكەین:

-دڕستەیا ئێكێدا: هەڤاڵكارێ (پار) سنوورەك بۆ دەمێ ڕویدانا كارێ رستەییێ دانایە، و بوویە تەمامكەرێ ڕامان و مەبەستا كارى.

- دڕستەیا دوویێدا هەڤاڵكارێ (زوو)تەمامكەری كارێ (كەلی)یە، بەلێ بۆ دەرخستنا ئەندازەیا وێ (زوو)ێ ودیاركرنا ڕامانا وێ مە هەڤاڵكارەكێ دی ل پێشیێ بكارئینایە كو (گەلەك)ە، دڤێ رستەییێدا هەڤاڵكارێ (گەلەك) دیاركەرێ هەڤاڵكارێ (زوو)یە، و هەردوو پێكڤە ڕامانا كارى تمام دكەن.

ئەگەر جارەکا دی ب هویری سەحکەینە رستەیێن (١،٢)، دێ بینین هەڤالکار بێ ئامرازێ پەیوەندی دەورێ خۆ وەك تمامکەرێ کاری دبینیت.

- بەلێ درستەیا سێیێدا پەیڤا (پەلە) ژ ئەگەرێ پێشگرێ (بە) دەورێ خۆ وەکو هەڤالکار دیتییە، و دبیتە تمامکەرێ کاری.

- درستەیا چوارێ ژیدا هەڤالکارێ (دناڤ گۆمێدا) تمامکەری کارێ (گرت)ە وهاتییە بکارئینان بۆ دیارکرنا سنوورەکی بۆ کاری و بوویە تمامکەرێ کارێ رستەیێ.

## دەستوور:

**١- هەڤالکار دناڤ رستەییێدا ڤان ئەرکێن خوارێ دبینیت:**

**ئـ- دبیتە تمامکەر بۆ کاری.**

**ب- دبیتە دیارکەرێ ( دیارخەرێ ) هەڤالکارەکێ دی و هەردوو پێکڤە دبنە تمامکەر بۆ کاری.**

**٢- هەڤالکار هەردەم دبیتە تمامکەرێ راستەوخۆ یێ کارێ رستەیێ**

## راهێنان ( ١ )

نموونەیێن رستەیان بۆ ڤان مەبەستان بینە:

١-رستەیەکێ هەڤالکارێ وێ دیارکەرێ هەڤالکارەکی دی بیت.

٢- رستەیەکێ هەڤالکارەکێ وێ ژ پەیڤەکێ و پێشگرەکی هاتبیتە دروستکرن.

٣-رستەیەکێ هەڤالکارەکێ جهی تێدابیت.

٤-رستەیەکێ هەڤالکارەکێ چەوایی تێدابیت.

## ڕاهێنان ( ٢ )

دڕستەیا (پێشمەرگە پۆل پۆل و زۆر بلەز ل ڕویبارى دەرباز بوون):-

ئـ-پەیڤا (پۆل پۆل) چییە؟ ئەرکێ وێ چییە؟

ب-بکەرێ ڕستەیێ بینە دەرێ؟

پ-(زۆر بلەز) چەوا دهێتە شرۆڤەکرن؟

ت-کارێ رستەیێ دیاربکە و بزانە چ جۆرە کارەکە و چەوا دروست بوویە؟

ج- ئەرێ چێدبیت هەردوو بێژەیێن (پۆل پۆل) و (زۆر بلەز) دڕستەییێدا لادەین؟ بۆچی؟

چ-ڕستەیا سەری ب زارێ کرمانجییا خوارێ بنڤیسە ڤە.

## ڕاهێنان ( ٣ )

ڤان هەڤاکاران درستەییێدا بکاربینە:

(زۆر باش ، گەلەك جوان ، پیچەك بلەز ، هندەك ب هێواشی).

## ڕاهێنان ( ٤ )

ئەڤان رستەیێن ل خوارێ شرۆڤەبکە:

١-مامۆستایێ مە وانەیێ باش دبێژیت.

٢-مەلەڤانی زۆر بلەز زارۆك ڕزگار کر.

٣-من گۆڤار ب پاڵدایی خواندەڤە.

# ئەدەب

١- ڕێبازێن ئەدەبی

ڕێبازا ڕۆمانتیکی ( ب گشتی )

٢- ئەدەبیاتێ کوردی سوڤیەتیا جاران.

٣- پەخشانا کوردی ( جۆرێن وێ )

٤- کوردییا پەتی

## نموونەیێن ئەدەبێ

١- سەی یاقۆبێ ماهیدەشتی

٢- عەلی حەریری

٣- مەحەوی

٤- شێخ ڕەزا

٥- ناری

٦-زێوەر

٧- شێرکۆ بێکەس

٨- شێخ غەیاسەدین نەقشەبەندی

٩- شێخ محەمەدێ خاڵ

١٠- ڕەوشەن بەدرخان

# رێبازێن ئەدەبی

## رێبازا ڕومانتیکی:

دەمێ بۆ جارا ئێکێ مە گوهـ ل پەیڤا ڕۆمانتیك دبیت ئێکسەر تشتێ هەست و ئاشۆپی (خەیالێ) وسۆز و شەیدابوونا سرۆشت و شوینوارێن کەڤن دئینە بیرا مە.

رێبازا رۆمانتیك ل ئەوروپا نیزیکی چاخ ونیڤا پشتی دەرکەفتنا رێبازا کلاسیکی سەرهلدا، ئەڤ رێبازا نوی شۆڕەشەك بوو دژی هەمی دەستورو بنەماییێن دەق وەرگرتنێن رێبازا کلاسیکی، شۆڕەشەك بوو بۆ رزگارکرنا ئەدەب و هونەر ژبن دەستهەلاتا سەپاندی یا ئەدەبیاتێ گریکی ولاتینیا کەڤن.

رێبازا ڕومانتیك:- ئازادکرنا حەزو ئارەزوو وڤەژاندنا سۆزو ودلچوونا مرۆڤی یە.

سەرکێشی وبەردانا فریشتەییێ ئەدەب وهونەرە، ڤەکرنا جیهانا بێ سنورە بۆ بژاڵە بوونا سۆزوگیانی.

پەیڤا رۆمانتیك ژ پەیڤا (رۆمانیوس Romanius) هاتییە کو بو وان زمانا دهاتە گوتن ئەوێن ژلاتینیێ پەیدابووین ول چاخێن ناڤەڕاست ب زارێ گشتی دهاتنە دانان ول دەسپێکا سەردەمێ ڤەژینێ (رێنیسانس) پیچ پیچە بوونە زمانێ نڤیسینێ وجهێ زمانێ لاتینی گرت. رۆمانتیکیا دەمێ ئەڤ پەیڤە بۆ رێبازا خۆ دانای، مەرەما وان ئەوبوو دیرۆك و ئەدەب و کەلتورێ نەتەوایەتیا خۆ ژ یێن گریك و

لاتينيێ جودا بکەن، کو بسەر کلاسیکیێدا زاڵببوو. یان ئەو پەیڤ ژ (Romance) هاتییە کو ل چاخێن ناڤەڕاست بۆ چیرۆکا خەیالی وپاشی سوارچاکیێ د هاتە گوتن چ ب شیعر یان ب پەخشان. (رۆمانس)ی پەیوەندی ب ئۆرستوکراتاڤە هەبوو. بەلێ زمانێ وی سادە وبساناهی بوو، زمانێ مللەتی بوو، پاشی دوو لق ژ (رۆمانس)ی چوون - ڕۆمانسا ئوستوکراتی و رۆمانسا میللی.

## * سەردەمێ دەرکەفتنا ریبازا رۆمانتیکی:

ریبازا رۆمانتیك ژ ئەوروپا دەرکەفتییە. بۆ جارا ئێکێ (فردریك شلیگل) ێ ئەلمانی رۆمانتیك وەك ریبازەکا ئەدەبی دژی کلاسیکیێ بکارئینایە، (مادام دوستایل)ێ ل ژێر کارتێکرنا وی ل فەرەنسا گەلەك بۆ گوت زێدەکر، ل فەرنسا کو مەڵبەندێ چەسپاندن و بەلاڤەبوونا وێ ریبازێیە. ساڵا ۱۸۰۰ - ۱۸۳۰ ب دەمێ فێرکرن وپێشڤەچوونا وێ ریبازێ دهێتە دانان. (فکتور هۆگۆ) رۆڵەکێ سەرەکی دچەسپاندنا ریبازا رۆمانتیك دا هەبوو، ساڵا ۱۹۲۷ شانۆگەریا (کرۆمۆیل) بەلاڤەکر، دپێشەکیاوێدا بەحسێ گەشەکرنا شیعرێ دکەت دمێژوویا مروڤایەتیێدا و دکەتە شیعرا لیریکی وشیعرا ئیپیکی و شیعرا دراماتیکی، ئەڤ پێشەکییە وەك بەیاننامەو ئنجیلا رومانتیکی وەسا بوو.

## تایبەتمەندیێن ڕێبازا ڕۆمانتیکی:

ژبەرکو ڕۆمانتیك کاردانەك بوو دژی دەستوورێن کلاسیکی، هەکە تایبەتمەندیێن کلاسیکیێ بەروڤاژی کەین، دێ تایبەتمەندیێن ڕۆمانتیکی کەڤنە بەر دەستێ مە کو یێن گرنگ ژ وان ئەڤەنە:

١-ڕۆمانتیك دەسەلاتا (عەقل)ی ددەتە ڕەخەکی، گرنگیێ ددەتە ئازادکرنا هەست و سۆزێ. شوینا مێشکی، دلی دکەتا کانیکا ئیلهام و جهێ هەست و ویژدانێ.

٢- ڕۆمانتیك ڤەگەڕیانە بو همبێزا سرۆشتێ بێدەنگ وتەنا، شاعیر ب سرۆشتی دبێژیت و حەز دکەت ب ڤەدەری تێکەلێ سرۆشتی ببیت و دهمبێزا سرۆشتیدا بکەڤیتە هزرێ و لدویف جوانیێ بگەڕیێت، شاعیر جوانیێ د هەمی دیمەنێن سرۆشتیدا دبینیت وب نەمانا بچویکترین دیمەن دلێ وی دچرمسیت و نەخۆشیان دبینیت و روندکان درێژیت، وەك وەریانا بشکوژەکا گولەکێ و ڕۆژئاڤابوون و غەوارەبوونا ستێرەکێ.

٣-ڕۆمانتیکێ باوەری ب ئازادیێ هەیە ژ دەربڕینا هەست و سۆز و ئاریان و گوهێ خۆ نادەتە چ دەستوور و قالبێن چەسپاندی. ڕۆمانتیك هەر دبنیاتدا شۆڕەش و ئازادییە، سەرکێشی و بەردانە بۆ وێ ئەندیشەیێ کو چ سنوران نانیاسیت.

٤-ڕۆمانتیك پویتەیی ددەتە تاکێ شاعیری وتاقیکرنا تایبەت، ئەڤ هەست وتاکاتی د خۆشەویستیەکا کویردا هەتا ڕادێ شەیدابوونێ خۆ دادنیت. خۆشەویستیا ڕۆمانتیك سیمایەکێ

پاقژییێ هەیە، وەك د دونیایا فریشتەیدابیت وەسایە، ئەڤ تاکایەتی و بێدەنگی و نازکی دبیتە حالەتەکێ دەروونییێ وەسا خودانێ وێ هەست ب بێزاری وخەم و کۆڤانا دکەت. دەربڕین ژ ئاریانێ پەردەکا خەما بسەردا دکێشیت، شاعیر وەسا هەست دکەت کو ئەو مەڵبەندێ هەمی دونیاییێ یە وگەلەك جارا تووشی بێزارییێ و ئاریانێ دبیت.

٥-رۆمانتیك دگرنگیدانێ ب دەم وجهی، تووشی هاڤییێ دبیت، دگەل سەردەم جهێ خۆ ناگونجیت، ب خەیاڵ بەرەف رابردووی ڤەدگەڕێتەڤە وخەما بۆ دەمێن خۆشێن بۆری دخۆت و بۆ رزگار بوونێ ژبۆ شاتیا دناڤ باژێریدا کو جهێ وییە بەرەف سرۆشتی درەڤیت.

٦-رۆمانتیك و نەخۆشیا سەردەمی، هیڤی و حەزێن رۆمانتیکیا د زۆربوون، بەلێ شیانێن بدەستڤە ئینانا وان هیڤیا نەبوون. جوداهیا دناڤبەرا هیڤیا زۆر شیانا کێم بۆ ئەگەرێ بێ هیڤی و رەشبینییێ، ئەڤێ ژی بەرەف بێزارییێ دژیانێدا دبرن و گازندە ژ بەختێ خۆ و دلڕەقیا زەمانی دکرن وب دەست تام دکرنە ئێش و ئازاران ومرۆڤ دشێت ب دوو ئەگەرا ژڤێ ئازارێ رزگار ببیت:

-یان سرۆشتێ خۆ بگوهۆڕیت ودەست ژ هیڤی و حەزێن خۆ بەردەت.

- یان سرۆشتێ دەرڤە بگوهۆڕیت وەلێ بکەت کو هیڤی و حەزێن وی پێ بدەستڤەبهێن.

٧- مۆرا دەڤەرێ:- رۆمانتیك دەمێ بەحسێ مرۆڤی دکەت، وەك تشتەکێ گشتی بەحس ناکەت، دەمێ بەحسێ هەست و سۆزێ دکەت وەك هەست و سۆزەکا گشتی بەحس ناکەت، بەلکی هەر مرۆڤەك هەست و سۆزەکێ مۆرا خۆ یا تایبەت وەردگریت، لیەی وی جهێ مرۆڤ تێدا ژیایە و ئەو مرۆڤێ هەست و سۆز لنك پەیدابوویە. مرۆڤێ ئەسپانی جودایە ژ مرۆڤێ یۆنانی، مرۆڤێ یۆنانی جودایە ژ مرۆڤێ ئەلمانی.

٨- ئەندێشەیا داهێنەرانە. لدەف رۆمانتیکا ئەدەب ب گشتی وشیعر ب تایبەتی زارڤەکرنا سرۆشت و ژیانێیە، ژێدەرێ داهێنانێ (خەلك)ە، ئامرازێ خەلکی ژی لدەف رۆمانتیکا ئەندێشەیا داهێنەرانەیە. ئەو ئەندێشا رەگەزێن ژێك ڤەبوویێن سرۆشتی یان واقیعی یان دەورێ رابردوو یان پێشبینیا پاشە رۆژێ پێکڤە گرێددەت. دڤی جۆرێ ئەندێشەیێدا، لێنێڕینا شیعرا دێ کویرو روون و ب ئاریان بیت و دێ گیانێ شاعیری هەژینیت و دێ بیتە تاڤیکرنا شیعری بۆ شاعیری ب خو.

٩- بابەتێ ئەدەبێ رۆمانتیك رۆمانتیکا ئەوروپی بابەتێن وێ تەقلیدی نینن دشێت هەر تشتەکی بکەتە بابەتێ نڤیسینێ، وەك دیمەنێن سرۆشتی، مێژوویا نەتەوایەتی، مۆرا دەڤەرێ، تشتێ تایبەت شوینا یێ گشتی، فەلسەفا میسالی، رەگەزێ نە ئاسایی، کاڤل، شەڤ، مرن، گۆڕ، خەون، . . .

١٠-چەوانیا دەربڕینا رۆمانتیکێ: رۆمانتیك د دەربڕینێدا دچیتە هندەك سیمایێن تایبەتی وەك: رزگاربوون ژ دەستوورو یاسایێ، ئالۆزی، تێکەل کرنا هەستان، ئالۆزیا ئەرکێ هونەرێن جوان، بەرچاڤ وەرگرتنا لایەنێ زاتی و لیریکی، . . .

## * رۆمانتیك د ئەدەبێ کوردیدا :

رۆمانتیك د ئەدەبێ کوردیدا، دشیعرێدا پتر دیاردبیت ژ جۆرێن دی یێن ئەدەبێ. هەرچەندە ڕەگەزێ رۆمانتیك بۆ سەدێ نوزدێ ڤەدگەڕیت وەك دهندەك شیعرێن حاجی و دشیعرێن مەولەویدا هاتییە، بەلێ ب شێوەیەکێ بەرچاڤ ئەو رەگەز ل نیڤا سەدێ بیستێ جهێ خۆ گرت، ب تایبەتی ل نیڤا هەردوو شەڕێن جیهانیدا. ئەڤە ژبلی کارتێکرنا ناڤخۆیی، کارتێکرنا دەرڤەژی ل سەر هەبوو، شیعرا نەتەوەییێن هەڤسوی ب تایبەتی شیعرا تورکی د وی سەردەمیدا کارەکێ زۆر کربوو سەر وێ لڤینا نویخوازی ئەوا بەرەڤ جێگیربوونێ دچوو، ئەڤە ژبلی کارتێکرنا شیعرا ئەورپی چ ب شێوەکێ راستەوخۆ بیت ب رێکا شیعرا تورکی و چ ب شێوەکێ راستەوخۆ بیت کارەکێ زۆر کربوو سەر هێزا لڤینا نویخوازیا شیعرا کوردی. هەرچەندە بزاڤا پێشکەڤتنخوازا تورکی ل سەدێ بۆریدا بزاڤا رزگاریخوازا کوردی ب خۆڤە نەگرت. دگەل هندێ ژی رەوشەنبیرێن کورد گەلەك مفا ژ ئەدەبێ پێشکەڤتنخوازیێ تورکی وەرگرت و گوهۆڕینەکا

بنیاتی ل شێوه و ناڤەڕۆکا شیعرا کوردی پەیداکر. کو ب راستی شوڕەشەك بوو دژی دەستوورو بنەمایێن رێبازا کلاسیکی.
پێشەنگێن ڤێ نویخوازیێ پێکهاتبوون ژ شێخ نوری شێخ سالح و رەشید نەجیب و گوران و پیرەمێرد. کو کارتێکرنا شیعرا ئەورووپی و تورکی ب ئاشکەرایی پێڤە دیار بوو.

### * بنەمایێن رۆمانتیکیێ دشیعرا کوردیدا:

١- پشت گوه هاڤێتنا کێشا عەرووزی کو شیعرا کوردیا کلاسیکی پێ هاتییە نڤیسین و ڤەگەڕیان بۆ کێشا ژمارەیی (بڕگەیی -پەنجەیی -خۆمالێ) کو کێشەکا رەسەنا کوردییە ولسەر بنەمایێ ژمارا بڕگێ نیڤ مالکێ هاتییە و هەمی شیعرا فولکلۆری وپتریا شیعرا زارێ گۆران و لۆڕی ب وێ کێشێ هاتییە نڤیسین.
٢- دەست بەردان ژ ئێکبوونا سەروایێ و بکارئینانا سەروایا مەسنەوی یان سەروایا رەنگا و رەنگ کو شاعیری لدویف پێدڤیێ بکاردئینا بۆ هندێ کو دگەل کێشا رەسەن ئاوازەکێ تایبەت بدەتە شیعرا خۆ.
٣- ئێکبوونا بابەتی دشیعرا رۆمانتیکیدا بسەر هەمی شیعرێدا دابەش دبیت، ئێکبوونەکا موکم دناڤبەرا هەمی مالکاندا هەیە وپەیوەندیەکا رامانێ وئەدەبێ یا موکم پێکڤە گرێددەت، راکرنا هەر مالکەکێ وزێدەکرنا هەر مالکەکێ شیعرێ تێکددەت.

٤- بكارئينانا زمانەكێ سادە و بساناهی كو هەمی كەس تێبگەهن نەك كۆمەلەكا دەست بژێر، پەیڤێن وێ هەمی كوردیەكا پەتییە و لپەی شیانێ شاعیر خۆ ژ بكارئینانا پەیڤا عەرەبی و فارسی و توركی یێن گران دویر دئێخیت. ئانكو پەیڤ و دەستەواژە و رستە دكورت و پەتی و پوخت و رەسەن و بێ گرێ وئالۆزی بن و رامانا وان یا ئاشكەرابیت.

٥- شاعیر لپەی شیانێ خۆ ژ هونەرێ رەوانبێژیا تەقلیدی ددەتە پاش و لدویف لێكچواندن و خوازە و هونەرێ جوانكاریا نوی دگەرێت.

٦- شاعیر ژبلی هندێ كو ب زمانەكێ سادە وبساناهی دنڤیسیت كو هەمی كەس تێبگەهن. نڤیسینا وی ژی بۆ هەمی كەسانە وژبۆ رەشبینیا خەلكی دنڤیسیت و نڤیسینا وی خزمەتا تەخا ستەملێكری وقوربانی دانێن جڤاكی دكەت.

٧-ڤەگەریان بۆ سرۆشتی ولێگەریان ل جوانیێ ژ دیمەنێن سرۆشتی وخەم خوارن بۆ دیمەنێن دلسۆژ وەك وەریانا بەلگێن دارەكێ و رژیانا ستێرەكێ و ئاڤابوونا هەیڤ و رۆژێ.

٨- خۆشەویستیەكا پاقژوبژوین وگەلەك جاران بێ هیڤیبوون ژ خۆشەویستیێ و سەحكرنا ژیانێ و پاشەرۆژێ ب چاڤەكێ رەشبینانە و پەسەندكرنا مەزنا هیێ و خو دویر ئێخستن ژ خەلكی.

٩-خۆیی (زاتیەت) وبەحسكرنا دەردوئێشێن تایبەتی و خۆ دویر ئێخستن ژ بابەت و هەست و سۆزا گشتی و لێگەریان لدویف وان دیاردا ئەوێن

کارتیکرنیَ ل دەروونی دکەن، خۆشیەکیَ بو چیدکەن یان زیانەکیَ دگەهینیَ و دئەنجامدا تووشی گەشبینییَ یان رەشبینییَ دکەن.

١٠- رابردوو دبیتە مەیدانەکا بەرفرەهـ، ئەندێشەیا شاعیری ڤەدگەڕێتە سەری و بابەتیَ ئەدەبی و دیمەنیَ گەش و جوان ژێ وەردگریت و سەرو ژنوی دروست دکەت و گەلەك جاران لدویف خۆشیا بۆری دگەڕییێت، چونکو دزانیت ئەو خۆشی چوو ئێدی نازڤڕیتەڤە.

١١- مفا وەرگرتن ژ کەلەپووریَ میللی ب هەمی کەرەستێن زمانی و بابەتیَ ئەدەبی بۆ نڤیسینا بەرهەمیَ وەسا کو گیانیَ میللی و نەتەوایەتی و نیشتمانی تێدا گەشببیت.

## رۆمانتیك د
## ئەدەبیاتیَ کوردیدا - شێوەییَ کرمانجییا خواریَ

دشێوەییَ کرمانجییا خوارێدا، دەسپێکا نویکرنا شیعرا کوردی و شکاندنا تۆك و یاسایێن کلاسیکییَ ل سالێن بیستیَ یێن سەدی بیستیَ دەستپێکر و ئێك ژ رێبەرێن ویَ نویخوازییَ (گۆران)یَ شاعیر بوو، کو لڤێرە دیَ ب کورتی ژیان و نموونەکا شیعراوی ل سەر رێبازا رۆمانتیکییَ ئینین و شرۆڤەکەین . . .

## گۆران ١٩٠٤ - ١٩٦٢

گۆران ناڤێ وی عبدوللایە و کوڕێ سلێمان بەگێ کاتبێ فارسییە. ل سالا (١٩٠٤)ێ زایینی ل باژێرکێ هەڵەبجە هاتییە دنیایێ. دزارۆکینییێدا لنك بابێ خۆ خواندییە، پاشی چوویە قوتابخانا سەرەتایی و دوو سالا ژی ل قوتابخانا ناڤنجییا کەرکووك خواندییە وژبەر مرنا بابێ وی و کوشتنا برایێ وی محەمەد بەگی، خواندنا خۆ هێلا و ڤەگەریا هەڵەبجە. دەمەکی مامۆستایێ سەرەتایی بوو، ل دەمێ شەڕێ دووێ یێ جیهانێ رێڤەبەرێ پشکا کوردی بوو ل ئێزگێ (رۆژهەلاتا نێزیك - الشرق الادنی) ل یافا، فەلستین. دەمێ شەڕ نەمای، ڤەگەڕیا سلێمانیێ. پشتی شۆڕەشا (١٤)ی تیرمەهێ سالا ١٩٥٨ و دامەزراندنا پشکا کوردی ل زانکۆیا بەغدا، بوو مامۆستا وانەبێژێ ئەدەب و رەخنەیا ئەدەبی. دژیانا خۆدا گەلەك تۆشی ئەشکەنجەو گرتنێ بوویە هەتا ل ١٨/١١/١٩٦٢ چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ.

### بەرهەمێن وی:

١-فرمێسك و هونەر.

٢-بەهشت و یادگار.

٣-سرۆشت و دەروون.

٤-لاوك و پەیام.

٥-هەڵبژاردە (وەرگێرانا کۆمەلەکا چیرۆکێن بیانییە).

٦-ژبلی ب دەهان گوتارو وەرگێڕان و وانەبێژیا ل کولیجا ئادابێ ل بەغدا.

نموونەك ژ شیعرا وی

## پایز

پایز! پایز
بووکی پرچ زەرد
من مات، تۆ زیز
هەردوو هاودەرد!
من فرمێسكم، تۆ بارانت،
من هەناسەم، تۆ بای ساردت،
من خەم، تۆ هەوری گریانت،
هەرگیز، هەرگیز
پایز! پایز!

* * *

پایز! پایز!
شان و مل ڕووت،
من مات، تۆ زیز
هەردووكمان جووت،
هەر چەند گوڵ سیس ئەبێ بگرین،
ئاڵتوونی دار ئەڕژێ بگرین،
پۆلی باڵدار ئەفڕێ بگرین،
بگرین ..، بگرین ..، چاومان نەسڕین،
هەرگیز، هەرگیز
پایز! پایز

(هەمی بۆ ژبەركرنێیە)

گۆران دڤێ هوزانێدا، دگەهتە وی پەڕێ رۆمانتیکێ، سۆزەکا مەزن و کویر ب سرۆشتیڤە گرێددەت ل خەمگینترین وەرزێ سالێ کو پاییزەو شاعیر ب رەنگەکێ وەسا تێکەلی سرۆشتی وپاییزێ دبیت کو هەردووك دبنە ئێك وچ سنور دناڤبەراواندا نامینیت

گۆرانی ژبەر چ پایز هەلبژارد دا ژوی وەرزی بچیتە دهمبێزا سرۆشتیدا چونکو مرنا (جوانیێ) تێدا دبینیت. جوانی ژی لنك گۆرانی هەمی تشتەو نەمانا جوانیێ دێ گەلەك ئێشینیت و دێ ئێختە ددنیایەکا پڕ ئێش و ژاندا... نەمانا بەلگێن دارێ، چرمسینا گولێ، مشتەختبوونا ڕەڤێن تەیروتەوالان .

دڤێ هوزانێدا گۆران پاییزێ وەك خۆ دبینیت، هەردووك (هەڤدەرد)ن. ئەڤ هاوکێشە وی دەمی بەرەف تەمامبوونێ دچیت کو گۆران هەڤبەرکرنێ بەرەفرەهتر لێدکەت، دیاردا خەم و کۆڤانا خۆ یا سرۆشتی بەرامبەر ئێك ڕادگریت:

فرمێسك = باران

هەناسە = بایێ سار

خەم = عەورێ گریانێ

ئەڤ دیاردە ب دیتنا گۆرانی دبەردەوامن و هەردەم عەدالەتا وی وسرۆشتی ژدەست تەنگاڤیان بدوماهێ ناهێت، ئەڤجا ئەڤەژی بەرەف بێ هیڤیا رۆمانتیکیانە دبەت وداخواز دکەت دگەل پاییزێ هەر بکەنەگری وچاڤێن خۆ پاقژنەکەن.

ئەڤ هۆزانە لسەر دوو لایەنی هاتییە دانان: شاعیر و سرۆشت (پاییز)، شاعیر هاوکێشەکێ دروست دکەت دناڤبەرا خۆ وپاییزێدا و هەردووکا پێکڤە دڤەهینیت و تێکەلی ئێك دبن وپێکڤە بەرەف دوماهیێ دچن کو بێ هیڤیبوونە،

***گرنگترین رەگەزێن رۆمانتیکی دڤێ هۆزانێدا ئەڤەنە :**

١- ڤەگەریان بۆ سرۆشتی وتێکەل بوونا گیانی ب گیانی دگەل دیاردێن خەمگین کو سۆزەکا کویر ددلێ شاعیریدا دلڤینیت وهەڤدەردەکی دناڤبەراواندا دروست دکەت.

٢-خەم وکوڤان خوارن بۆ نەمانا جوانیێ. کو دڤێ هۆزانێدا ژ چرمسینا گولێ و وەریانا بەلگێ دارێ وفرینا بالدارا دەردکەڤیت وهەمی نیشانا مرنێنە، مرن ژی ئێکە ژوان بابەتێن رۆمانتیك خۆ پێڤە مژویل دکەت.

٣- خەیالەکا رۆمانتیکیانە یا بەرفرەه تێدایە، بۆیە جهێ دروست کرنا گەلەك وێنەیێن هونەرێ جوان. وەك (بووکی پرچ زەرد) و (شان ومل رووت) بۆ پاییزو (رژانی ئالتونی دار).

٤-هۆزان لسەر کێشا برگەیی (پەنجەیی -خۆمالی) هاتییە نڤیسین و کێشا ئازادە، چونکو شاعیری شێوازێ چوار برگەیی کرییە بنەماو دهەر نیڤەکێ ئێك شێواز یان دوو شێواز ئینایە، ئانکو (٤) یان (٨) برگەیە.

٥- سەبارەت سەروا، گۆرانی سێ چوارینێن بەراهیێ ب سەروا لدویف ئێك ئینایەنە کو ب ڤی رەنگی دارشتینە (أ ب أ ب) چوارینا دوماهیێ ژی هەمی نیڤێن وێ لسەر ئێك سەروا دچن دبێژنە ڤێ (چوارینا تەمام) ئانکو گۆرانی خۆ ب ئێکبوونا سەروایێ گرێ نەدایە.

٦- پەیڤێن وێ هەمی کوردینە ودهەمی هۆزانێدا پەیڤێن بیانی بکارنەئینانە، چێدبیت تنێ پەیڤەکانە کوردی تێدابیت ئەوژی (ئالتۆن)ە.

٧- دووبارەکرنا هندەك پەیڤێن تایبەتی وەك (پاییز) کو کاکلا هۆزانێیە، بابەتێ وی کویرتر لێکرییە، ژبلی وێ ئاوازا نازك کو ژ دەنگێ پەیڤان پەیدادبیت و هۆزانێ پڕ ئیقاعێ خەمگین دکەت.

## * ئەدەبیاتێ رۆمانتیکا کوردی - شێوەیێ گۆران

دئەدەبیاتێ زارێ گۆراندا هەر شیعر بسەر جۆرێن دی یێن ئەدەبی زاڵە. شیعرا شێوەیی گۆران هەر ژ دەسپێکێ رێکا خۆ یا تایبەت گرتییە و خودان ساخلەت وسیمایێ تایبەتێ خۆ بوویە، کو ژ گەلەك لایانڤە ژ شیعرێن شێوەیێن دی یێن کوردی جودایە. ئێك ژ سیمایێن هەرە دیارێن شیعرا وی شێوەیی ئەوە، کو کێم جار نەبیت، نەکەڤیتە ژێر کارتێکرنا کێشا عەرووزێ و ئێکبوونا سەروا غەزەلا عەرەبی، فارسی وەك شێوەیێن دی . . گەلەك شاعێرێن خودان شیان ژ وی

شێوەیێ زمانێ كوردی پەیدابووینە ومەولەوی ئێكە ژ شاعیرێن وێ یێن مەزن. شیعرێن مەولەوی پڕن ژ هەستا خۆیەتی وخەم و كۆڤان و بەحسێ مەرگ و مرن و وەسفا سرۆشتی و هەستێ سۆفیومانەیا كویرو سووتان ب دەردێ دووریێ و بێزاریێ ژ ژیانێ و خوزی خواستن بۆ مرنێ . . . ئەڤەژی رەگەزێن سەرەكی یێن رێبازا رۆمانتیكینە، ئەڤجا ل سەردەمێ مەولەویدا، كو سەدێ نۆزدێیە، رێبازا رۆمانتیكی دكوردیدا پەیدانەببوو. بەلێ دگەل هندێ ژی ئەم دشێین پتریا شیعرێن مەولەوی ب رۆمانتیكی دانین. ژبەر وێ چەندێ لڤێرە دێ نموونەكا شیعرا مەولەوی بۆ ڤێ رێبازێ وەرگرین و شرۆڤە كەین.

# مەولەوی

مەولەوی ناڤێ وی (عبدولڕەحیم) کوڕێ (مەلا سەعید)ە و نازناڤێ وی (مەعدووم)ە و ب (مەولەوی) ناڤدارە، ب شەش بابا دگەهتە مەلا ئەبو بەکرێ موسەنیف، خودانێ کتێبا (الوضوح) و ژبنەمالا پیر خدرێ شاهۆیە.
ل سالا ١٨٠٦ ل گوندێ (یاقشلاخ) سەر ب دەڤەرا تاوەگوز هاتییە دنیایێ. ل بەراهیێ لنك بابێ خۆ خواندییە، پاشی بۆ خواندنێ چوویە (مەریوان و چوڕونەنەو سنە و بانەو سلێمانی و هەڵەبجە).
بۆ جارا دووێ دچیتە سنە و ل مزگەفتا (دار الاحسان) لنك حاجی مەلا ئەحمەدێ نۆتشی دخوینیت و سالا ١٨٤١ دەستویریا مەلایەتیێ ل وێرێ وەردگریت و ڤەدگەڕیتە وەلاتێ خۆ. پاشی بدویف شێخ وەسمانێ تەوێڵە دکەڤیت و تەریقەکا وی ژێ وەردگریت. ل (چۆرە و بێژاوە و بیاوێڵ) وپاشی ل سەرشاتە پشت کەلها (شمێران) سیروان دەرسا دبێژیت. ل سالا ١٨٨٢ هەر ل سەرشاتە دچیتە بەر دلۆڤانیا خودێ و گۆڕێ وی بوویە مەزارێ شەیدایێن وی وشیعرێن وی.

## گرنگترین بەرهەمێن مەولەوی ئەڤەنە :

١-الفضیلة، ٢٠٣١ مالکێن شیعرا عەربینە.

٢-العقیدة المرضیة، ٢٤٥٢ مالکێن شیعرا کوردینە.

٣-الفوائح، ٥٢٧ مالکێن شیعرا فارسییە.

٤-دیوانا مەولەوی، کو شیعرێن خۆ تێدا بەلاڤەکرینە.

نمونەیەك

١-ئێمشەو هەم دیسان دەروون پڕ خەمەن
ئەساسەی ماتەم جەلامان جەمەن

٢-نەتاو دووری دڵ بێ قەرارەن
بینایی دیدەم جە خەفەت تارەن

٣-شریخەو گرمەی هەور دووریی دۆس
وەفەنا بەردەن مەغەزو ڕەگ پۆس

٤-شەپاڕەی گرپەی ناری مەهجووری
کەردەن وەغوبار کۆگای سەبووری

٥-نەتاقەت مەندەن نەتۆی دەروونْدا
نە لەیلی مدیۆ وەلای مەجنووندا

٦-یاخوا مەردەنی بۆ وە میهمانم
ئیتر نەوینوون دووریی یارانم

٧-بەڵکم خەلاسیم نەدەس دووریم بۆ
بەو زووخی زامان نەشوون وەگلکۆ

(هەمی بۆ ژبەرکرنێیە)

## رامانا پەیڤان:

ئەساسە : بنیات ، ئەگەر

ماتەم : بەهی ، تازی

جەلامان : لنك مە

جەمەن : هەمی ، کۆمبوون

نەتاو دووری : ژ ئەگەرێ دووراتیا وێ

بێ قەرار : بێ هەدار

دیدە : چاڤ

تار : تاری

دۆس : دۆست ، برادەر

فەنا : ژناڤچوون ، نەمان

مەغەز : مەژی

ڕەگ : دەمارێن لەشی ، ڕەه

پۆس : پیست

شەڕاڕە : چریسك

گرپە : گوری

نار : ئاگر

مەهجووری : ژێك ڤەبوون

کەردەن : کرییە

مەندەن : مایە

تۆی : تۆڤ ، ناڤگ

مدێو : بەرێ خو ددەتێ

وەلای : لنك وی

مەردەنی : مرن

میهمان : مێهڤان

نەوینوون : نەبینم

زووخ : کێم

زامان : برین

نەشوون : نەچم

گڵکۆ : گۆڕ ، قبر

مەولەوی بەحسێ خەم و کوڤانێن دلێ خۆ دکەت ل شەڤەکێ، چەوا وێ شەڤێ بەر کولو کۆڤانا دنالی و چاڤێت وی ژ گریانێ تاریبوون ژبەر دووراتیا دۆستا وی و مەژی و گیانێ وی حەلیا و سەبر و هەدار نەمان . . . بێ هیڤی بوویە، چونکو نە وی تاقەت مایە و یارا وی ژی پویتە پێ ناکەت، ئێدی ژبەر وێ بێ هیڤیبوونێ داخوازا مرنێ دکەت دا ژ دەردێ یارا خۆ ڕحەت بیت وب وێ برینا کویربن ئاخ بیت.

گرنگترین ڕەگەزێن رۆمانتیکی دڤێ شێعرێدا ئەڤەنە:

١-شاعیری شەڤ هەلبژارتییە بەحسێ خەمێن خۆ د وێ شەڤێدا دکەت. . .
شاعیرێن رۆمانتیک گەلەك جاران بەحسێ شەڤێ دکەن، کو دنیا مت و بێدەنگ دبیت و تەناهی بسەر دنیایێدا دهێت، ل وی دەمێ مت و تەنادا خۆ دکێشنە ناڤ دنیایەکا تایبەتی و هزرا ابردوویێ خۆشێ بۆری وپاشەرۆژەکا خەیالی دکەن.

٢- شاعیر بەحسێ دویرکەفتنێ دکەت و کارتێکرنا وێ دووریێ ل سەر هەست و مێشك و دەمارێن وی نیشا ددەت. چونکو دویرکەفتن ژ خۆشتڤیێ ئێکە ژ ئەگەرێن سەرەکی یێن بێ بەختیا عاشقی. ئەو دویرکەفتن شاعیری دئێختە ئێش و ئازارو خەیالاندا، وەلێ دکەت کو هزرا دەمێن خۆشێن بۆری بکەت و بەراوردیەکێ بکەت دناڤبەرا وی دەمی کو دگەل یارا خۆ خەمێت خۆ درەڤاندن و نوکە یێ ب دویرکەفتنا یاری دنالێت.

٣- دڤێ رەوشا دەروونیا دژوار ئەوا شاعیر تێدا دژیت ژ ئەنجامێ دویراتیا یارا وی، تووشی سەرگێژیێ و بێ هیڤیبوونێ دبیت، هیڤی ب دیتنا دۆستێ نامینیت و ژیان ژی بۆ دۆستێ چ رامان تێدا نامینن. چونکو دۆست و ژیان لنك شاعیری دبنە ئێك، ئێدی ئەو بێ هیڤیبوونە دگەهتە وی رادەی و شاعیر مرنێ دخوازیت.

٤-مەولەوی وەك هەمی شاعیرێن شێوەیێ گۆران، کێشا بڕگەیی (پەنجەیی - خۆمالی) بکارئینایە و هەمی شیعرێن خۆ ل سەر کێشا (١٠=٥+٥) بڕگە نڤیسینە، ئەڤە ژی کێشەکا کوردییا گەلەك بەربەلاڤە و هەتا گۆرانێ شاعیر ژی ئەڤە ب کێشەیەکا شیعری یا نەتەوەیی دانایە . . .

٥- ژلایێ سەروایێڤە، ئێکبوونا سەروایێ بکارنەئینایە، سەروایا مەسنەوی بکارئینایە، ئەڤ سەروا مەسنەوی پتر دەلیڤێ دێ ددەتە شاعیری کو درێژییێ ب هەستێ ناڤخۆیی بدەت و پەیڤا باشتر و گونجایتر هەلبژێریت.

٦- ئەو پەیڤێن بکارئیناین پتریا وان پەیڤین رەسەنێن کوردینە هەکە پەیڤا بیانی ژی بکارئینابیت، ئەوێن بکارئیناین گەلەك دبەربەلاڤن و هەمی کەس تێدگەهین.

٧- وێنە و لێکچواندن و خوازە گەلەك د بەربەلاڤن و هەمی کەس تێدگەهن، لدویف دارشتنا ئالۆز و دویر دەست نەگەڕیایە. دبێژی لناڤ دۆستان رونشتییە و بەحسێ ئێش و خەمێن خۆ بۆ دکەت.

## * ئەدەبیاتێ رۆمانتیکا کوردی - شێوەیێ کرمانجییا ژووری

دشێوەیێ کرمانجییا ژووری ژیدا، وەك شێوەیێ کرمانجییا خوارێ، شیعرا کوردی دناڤبەرا هەردوو شەڕێن جیهانێ ل سەدێ بۆری گوهۆڕینەکا بنیات ب خۆڤە دیتییە وسیما و ساخلەتێن نوی وەرگرت، نویکرنا شیعرا شێوەیێ کرمانجییا ژووری ب رەنگەکێ دیار ل سالێن سیها ژ سەدێ بۆری پەیدابوو ب تایبەت دگوڤارێن هاوار و روناهی و ستێردا، کو مینبەرێ بەلاڤەکرنا شیعرا نویا وی شێوەی بوون، گەلەك شاعیرێن کرمانجییا ژووری رۆڵەك د وێ نویکرنێدا

هەبوو وەك قەدری جان و کامەران بەردخان و جگەر خوین و . . هتد کو دەست ژ دەستوورێن شیعرا کلاسیکی بەردا وب شێوازەکێ نوی بابەتێن نوی ئینان. شیعرا لیریکی و شۆرەشگێری ل وی سەردەمی بەلاڤەبوون چونکو رەنگڤەدانا راستەقینەیا رەوشا نەتەوەیا کورد و کوردستانێ ل وی وەختی بوون. شۆرەشا رزگاریخوازا کورد و ئەو کارەساتێن تۆشی کوردان بووین، رۆلەکێ سەرەکی هەبوو ل سەر هەست و سۆزا شاعیران و گەلەك وان ژئەنجامێ شکەستنا وان شۆرەشا بێ هیڤیبوون و گەلەکا ژی ب چاڤێن روون سەحا پاشەرۆژێ دکرن و باوەری ب سەرکەفتنێ هەبوو. ئەڤە هەمی دشیعرا وی دەمیدا دیارە . . ئێك ژوان شاعیرا کو هەر ژ دەسپێکێ ب چاڤەکێ نوی سەحا ژیانێ و دەوروبەرا دکر و رەخنە ل کێم و کاسیێن جڤاکێ پاشکەفتی یێ کورد دگرت و ب شەهیدێن شۆرەشێ دگوت، جگەرخوین بوو، کو پاییێ وی د وێ نویکرنێدا گەلەك ئاشکەراو دیارە . . . ژبەر ڤێ چەندێ لڤێرە دێ شیعرەکا رۆمانتیکی یا جگەرخوینی وەرگرین و شرۆڤەکەین.

# جگەر خوین

ناڤێ وی شێخ मووسا یە کوڕێ محەمەد کوڕێ مەحموود کوڕێ عەلییە، سالا ۱۹۰۳ ل گوندێ (حەسار) ل دەڤەرا (مێردین) هاتییە دنیایێ.

جگەرخوین ژ خێزانەکا هەژار و نەدار بوو. هەر زوی دایك و بابێ وی نەمان و دگەل برایێ خۆ یێ مەزن پێکڤە ژیان. نەچاربوو ب کرێکاری و نۆکەری شولی بۆ دەرەبەگ وئاغا و دەولەمەندان بکەت، سالا ۱۹۲۰ بۆ خواندنێ دچیتە دیاربەکر و ل گەلەك جها دگەڕیێت، سالا ۱۹۲۵ دەمێ ئاگرێ شۆڕەشا شێخ سەعیدێ پیران هەلبووی، وهەر زووی هاتییە ڤەمراندن، ئەڤێ کارەکێ مەزن ل جگەرخوینی کر. سالا ۱۹۲۷ جگەرخوین نەچاربوو جزیرا کوردستانا تورکیا بجهـ بهێلیت و ڤەستا سوریێ بکەت ول (عاموودە) ئاکنجی بیت. دەمێ کۆمەلا (خۆی بوون) ل وێ سالێ هاتییە دامەزراندن. جگەرخوین ئێك بوو ژ ئەندامێن وێ یێن چەلەنگ. دەمێ گۆڤارا (هاوار) دەرکەفتی. ئێك ژ وان شاعیرێن بەردەوام شیعرتێدا بەلاڤەدکر، جگەرخوین بوو.

جگەرخوینی دژی ئاغا و دەرەبەگ وشێخا د نڤیسی وکارێن وان یێن خراب رسوا دکرن، دهەوارا هەژارو لێ ڤەومیا و زۆردارلێکریا دچوو، ب ڤێ ژی خۆ تووشی گەلەك ئارێشە ونەخۆشیا دکر.

پشتی شۆڕەشا (١٤)ی تەمووزا سالا ١٩٥٨ جگەرخوین هاتە بەغدا و ل پشکا کوردی کولیژا ئەدەبیات ل زانکۆیا بەغدا دەرس دگوتن. سالا ١٩٦١، دەمێ شۆڕەشا کوردی دەستپێکری، جگەرخوین ل بەغدا بوو، بەلێ گەلەك لاینگریا

شۆڕەشێ دکر و حکومەت ژ هەلویستێن وی یا رازی نەبوو، گڤاشتن دئێخستنە سەر، ئەوژی نەچاربوو ل سالا ١٩٦٣ ڤەگەڕێتە سوریا. سالا ١٩٧٨ جگەرخوینی قەستا دەرڤەکر ول سوید ئاکنجی بوو. هەر یێ مژویلبوو ب کارێ ئەدەبی وچاپکرنا بەرهەمێن خۆ. هەتا ل ٢٢/١٠/١٩٨٤ ل سوید چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ ولسەر وەسیەتا وی تەرمێ وی ئینایە کوردستانێ ول قامشلو ل ناڤ باغچێ مالا وی هاتە ڤەشارتن.

## بەرهەمێن جگەرخوینی:

١-ئاواو دەستوورا زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٦١

٢-فەرهەنگا کوردی، بەرگێ: ١و٢، بەغدا ١٩٦٢

٣-شەش دیوانە شیعر

## نموونەك ژ شیعرا وی

### سەرمەستێ ئەڤینم

١-ئەی هەڤـــالا ئەڤینـــــدار

توو ژی وەك من برینـــــدار

٢-کەنگی کۆ ئەم دگهین هـەڤ

ب دلـخوەشی رۆژ و شــەڤ

٣-گول و چیچەك گـەش دبن
دلـــی داران خـــوەش دبن

٤-سونبـــول هـــاویر دهەژین
ئـــەڤ ستێـــــرك دڕژین

٥- چیـــا بلّنـــد دبـــن ژۆر
جهـــان دبت کەســکە سۆر

٦-بـــا تـــێ بەســـازو لیـــلان
تـــەروەنـــدە هـــاویر دلان

٧-ئـــاڤێن گـــۆلا ددن پێـــل
ڕوێ ڕۆژێ دبـــت سێــــل

٨-تلوور کەســك و زەردو سۆر
ب بـــازکـــان دچـــن ژۆر

٩-وەکو لۆکـس وچرا گـەش
رۆنـــــی ددن شـــەڤـــا ڕەش

١٠-پڕگەش دبـــن گـــولێ من
تـــەڤ دڕەڤـــن کـــولێ من

١١-گـــول وچيچەك ئـــەزو توو
قـــازو ئــــۆردەك ئەز وتـوو

١٢-هـــەردوو ڕەوشا ڤێ ژينێ
دەنگـــێ ســـــازا ئـــەڤينێ

(ژدەسپێكێ، شەش مالك بۆ ژبەركرنێنە)

## رامانا پەيڤان

هەڤال : دوست، برادەر
ئەڤيندار : عاشق
كەنگی : چ دەم
دگهين : دگەهين
هەڤ : ئێكدوو
چيچەك : گول چيچەك
هاوير : ل هەر چوار لا، دەوروبەر
ستێرك : ستێر
دبت : دبيت
تێ : دهێن
ساز : ستران، ئاواز
ليلان : باكوزيرك

تەرەوەند : تشتێ بژارە

پێل : شەپۆڵ

تلوور : تەیرو تەوال، باڵندە

بازك : بازدان

لۆكس : چرایێ گازێ (لۆكس)

رۆنی : روناهی

پڕ : تژی

تەڤ : هەمی

كول : خەم و كەسەر

ئۆردەك : وەردەك

رەوش : بوار

جگەرخوین دڤێ شیعرێدا، ب رەنگەكێ رۆمانتیكیانە بەحسێ پەیوەندیا خۆ و ئەڤینداراا خۆ دكەت. كو نوكە ژبەر وێ چەندێ كو ژێك دویرن، دلبرینن، ئانكو ب ئێش وخەم وكۆڤانن، ئاخینكا بۆ وێ رۆژێ رادهێلن كو بگەهنە ئێك، هەر دەمێ ئەو دگەهنە ئێك، دنیا دهێتە گوهۆڕین، هەمی دبیتە خۆشی وشادی، ئەو خۆشی ژی ژڤان دیمەنا دەردكەڤیت:-گەشبوونا گول و كولیلكا، دەركەفتنا سونبول وستێرا، بلندیا چیا، وشەوشا بای، پێلێن ئاڤێ و

ئاڤا بوونا رۆژێ و فڕینا ب کۆما تەیران . . ل وی دەمی ل بن سیبەرا ئەڤان دیمەنێن جوانێن سرۆشتێ، کو ب ئێك گەهشتنا هۆزانڤانی و ئەڤیندارا وی ئەو دیمەن جوانتر لێ کرن، ئەو و ئەڤیندارا وی دوو دووە وەکو گول و کولیکا یێن تێك وەربین و وەکو قازو قولنگان ل دۆر ئێك دزڤڕن و هەردووك دبنە رەوشا ژیانێ و دەنگ و سازیا ئەڤینێ.

## گرنگترین ڕەگەزێن رۆمانتیکی دڤێ هۆزانێدا ئەڤەنە :-

١- هۆزانڤانی و هەڤالا وی هەردووك دبڕیندارن، بریندارێن دەردێ جودابوونێنە، ئەڤە ژی بوویە ئەگەرا هندێ هۆزانڤان تووشی ئازارەکا مەزن بوویە کو جیهان ل بەر چاڤان تاری بوویە، وبتنێ ب گۆڕینا ڤێ رەوشا جودابوونێ هۆزانڤان دێ ڤەگەڕیتە سەر رەوشا خۆیا ئاسایی وجیهان دێ ل بەرچاڤان جوانتر و گەشتر بیت.

٢- ئێك ژ سیمایێن دی یێن رۆمانتیکی کو دڤێ هۆزانێدا دیاردبیت وەسفا سرۆشتی و جوانییێە. هۆزانڤانێ رۆمانتیکی هەردەم ل دویڤ جوانیێ دگەڕیێت و ل هەمی دیمەنێن وردێن سرۆشتی دا جوانیێ دبینیت وئەڤ جوانیە ل بەرچاڤێ وی مەزن دبیت وهەمی گیانێ وی دادگریت، ئەڤ جوانیە ژی دڤان دیمەناندا دەردکەڤیت :-

گەش بوونا کولێ و کولیلکان، ڤەهەژیانا سونبولان، بلنداهیا چیایان، کەسك بوونا دونیایێ، دەنگێ بای، شەپۆلێن دەریایێ، دیمەنێ سوورێ ئاڤابوونا رۆژێ، هۆزانڤانی زێدە ڕوویی تێدا کرییە، ب تایبەت دەمێ دوو هەڤال دگەهنە ئێك.

٣-هۆزانڤان دەرمانێ دەردێ دلێ خۆ ژڤی سرۆشتێ جوان دبینیت، کو ئەڤ هەمی دیمەنێن جوان شەڤا وی یا تاری بۆ روون دکەت و دەردو کەسەر و خەمێن دلی دهاڤێژیت. دیسان بەحسکرنا شەڤێ کو هێمایێ تاری و نائومێدیێ یە سیمایەکێ دی یێ وێ رێبازێیە، وهوزانڤان ب دیمەنێن گەشێن سرۆشتی وێ شەڤا تاری روون دکەت.

٤-ئومێدا هۆزانڤانی دوێ چەندێدا دەردکەڤیت کو ئەو و هەڤالاوی ل بەر سیبەرا سرۆشتێ گیان بەخش ودویر ژ خەم و کول و کۆڤانان دگەهنە ئێك خۆ د ئێك دئالینن و وەکو گول و کولیلکان ب ئێك دگرنژن و وەکو قازو وقولنگا ل دویڤ ئێك دزڤڕن . . ل دیماهیێ ژی هەردووك دبنە ڕەوشا ژیانێ وساز و ئاوازا ئەڤینێ و خۆشەویستیێ.

٥- ژلایێ ڕوخساری ڤە ئەڤ هۆزانە هەمی ب کێشا بڕگەیی (پەنجەیی - خۆماڵی ) هاتییە نڤیسین، (١٠=٥+٥) بڕگەیە. ئەڤەژی ئێکە ژ کێشێن هەرە بەلاڤێن هۆزانا کوردی.

٦-هۆزانڤانی ب سەروایا مەسنەوی (جووت سەروا) هۆزان ڤەهاندییە، ڕامان ژێ ئەڤە هەردوو نیڤ دێرێن هەر دێرەکێ ب ئێك پیت دیماهی هاتینە، پەیوەندی ب سەروا دێرێن دی ڤە نینە، وئەڤە ژی ژ سەروایێن هەرە بەلاڤە دهۆزانا کوردیدا.

داستانێن درێژ و چیرۆکە هۆزان و هەڵبەستێن فۆلکلۆرییێن ڕەسەنێن کوردەواری هەمی ب ئەڤێ جۆرە سەروایێ هاتینە نڤیسین.

٧- پەیڤ، هەمی پەیڤێن کوردیا پەتینە، و دڕەسەنن، هۆزانڤانی خۆ دویر ئێخستییە ژ بکارهینانا پەیڤێن بیانی.

٨- دارشتنا رستەیان یا رەهوانە، وبێ گرێ و ئالۆزیە، رستەیێن سڤك و کورت بکارئینانینە، ئەڤێ چەندێ ژی هۆزان ب سانەهیتر لێ کرییە، وهەمی کەس خۆشیێ ژ خواندنا وێ وەردگرن، وپێڤە ماندی نابن.

## ئەدەبیاتێن کوردێن سۆڤێتا جاران

د بارودۆخێ تایبەتێ کوردێن ئێکەتیا سۆڤێتیا بەرێدا، ئەدەبیاتێن نوی یێن کوردێن سۆڤیتێ ل سەر بناغێ ئەدەبیاتێن فۆلکلۆریێ کوردی هاتییە دامەزراندن.

گەشکرنا وان ئەدەبیاتا مل ب ملێ ڤەکۆلینا و مفا وەرگرتن ژ داستانا دەوڵەمەندا مللی چوو، وبوو ئێك ژ نیشانێن ئاشکەرایێن بەرز یێن گەشەکرنا رەوشەنبیریا کوردێن ئێکەتیا سۆڤێت. ب ڤی رەنگی گەلەك بەرهەمێن ئەدەبی یێن وەسان هاتنە نڤیسین کو ناڤێ خودانێن وان دمێژوویا ئەدەبێ کوردی دا بێنە تۆمارکرن. وژوان:

نادر، جاسمێ جەلیل، موسەیێ ئاخوندۆڤ، یوسفێ بەکۆ، باخچۆیێ سلۆ . . . وهتد.

ژ نڤیسەرێن کوردێن ئێکەتیا سۆڤێت عەرەبێ شەموٚ نە بتنێ ناڤ و دەنگ ل ئێکەتیا سۆڤێت هەبوویە، بەلکو ل دەوروبەران ژی ناڤ ودەنگیەکا زۆر هەیە. عەرەبێ شەمۆی دەست ب نڤیسینا وتارێ کر د بیاڤێن جۆدایێن کارو بارێ رەوشەنبیریا کوردی و ژیانا کۆمەلایەتی یا وان گوندێن کوردێن ئێزدی لێ دئاکنجی، هەروەسان دبوارێ ئەدەبی و ئامادەکرنا رۆژناما (زاریا فوستوکا -کازیوەی ڕۆژهەلات) کارکرییە.

نڤیسینێن عەرەبێ شەمۆ ب زمانێ ڕووسی بوون، چونکی ئەڤ نڤیسینە بۆ وان زانا و رەوشنبیر و رۆژهەلاتناسێن ئەوروپی بوون کو گرنگیەکا تایبەت ددانە ڤەکۆلینێن کوردی ب شێوەیەکێ گشتی.

ئێك ژ بەرهەمێن ب ناڤ و دەنگێن وی چیرۆکا (شڤانێ کورد)ە، وسرۆشتێ (ئەفتۆبیۆگرافیا -مێژوویا ژیان)ێ هەیە، هەر دسالێن (سیهان)دا ب کوردی بەلاڤەکرییە و گەلەك زوی هاتنە وەرگێران بۆ سەر زمانێ ئەرمەنی و ڕووسی و ئەڵمانی ل سالا (١٩٥٧) بزمانێ جورجی هاتبوو بەلاڤەکرن بەری هینگێ ژی هاتبوو وەرگێران بۆ فەرەنسیێ.

(شڤانێ کورد) و (کوردێ ئەلەگەز)[1] ژبەرهەمێن کەڤنێن کوردێن ئەرمەنستانا سۆڤێتینە.

دئەڤان هەردوو بەرهەمان دا نڤیسەر راستگۆیانە نەخشێ ژیانا زەحمەتکێشێن ئێك ژ دەڤەرێن کوردنشین دکێشیت و سەخت و دژواریا وێ ژیانا ل بن دەسهەلاتا کەڤندا نیشان ددەت، وێنەیێ ڕەنج خۆران دکێشیت و وێ چەندێ ژی بۆ مە نیشان ددەت کا چەوا ئەو ڕەنج خۆرو کەڤنە پەرێست ل دەسپێکا دامەزراندنا رژێما سۆشیالیستی دا دبوونە بەربەستێن ئاکنجیێن کوردێن کۆچەر. دئەڤان هەردوو چیرۆکاندا پەیدابوونا شارەزاو کادرێ کورد ب دروستی دهێتە بەرچاڤکرن. عەرەبێ شەمۆ ل سالا (١٩٣١) ێ دا ئێکەم چیرۆکا خۆیا سەر شانۆیێ ب ناڤێ (کۆچاکێ دەرەڤین - خودا پەرستێ درەو) بەلاڤەکرییە، تێدا پەردێ ل سەر پاشمایێ هزرا کەڤنە پەرێستیا دناڤ کوردان دا بەلاڤ ڕادمالیت.

هەر دئەڤان سالاندا عەرەبێ شەمۆ ب نڤیسین و ب وەرگێران گەلەك نامیلکێن سیاسی و هۆشیارکەر بۆ کوردێن سۆڤیتێ دەرئێخستن.

---

(١) ئەلەگەز: چیایەکە ل ئەرمەنستانا سۆڤیتی، کورد لێ دئاکنجینە.

## کورتیەك ژ ژیانا ( عەرەبێ شەمۆ )ی

ئەڤ نڤیسەرێ بلیمەت ناڤێ وی (عەرەب)ە، کورێ (شێخ شەمۆ)یێ (شێخ شامیل)ە، ژبنەماڵەکا کوردێن ئێزدی یە، ل سالا (١٨٩٥ز)ێ دا ل گوندێ (سووسر) ل دەڤەرا (قارس) ژدایك بوویە، وسەختیا ژیانێ دیتییە، و دهەمی مەیدانێن ژیانێدا خەبات کرییە، ئەگەر سەحکەینە تۆمارا بەرهەم ونڤیسینێن وی دگەل وان بەرهەمێن مە بەحس کرین ودگەل گەلەك وتارو نامیلکێن سیاسی و کۆمەلایەتی و زمانەڤانی دا ئەڤ بەرهەمێن ئەدەبی ژی دێ بینین:-

١-ڕەبەن[١]، ١٩٣٠ (چیرۆکەکا سەرشانۆییێ یە).

٢-بەربانگ [٢]، ١٩٥٧.

٣-ژینا بەختەوەر، ١٩٥٩.

٤- کوردێ ئەرمەنستان، ١٩٦١ (سیناریۆیە بۆ سینەمایێ).

٥-دمدم ، ١٩٦٦. ئەڤەژی ڕۆمانەکا [٣] مەزنە ژ چیرۆکا رویدانێن مێژوویی یێن کەلا دم دم هاتییە وەرگرتن.

٦-حەکایەتێ کوردی ناڤی خەلك، ١٩٦٧.

٧-کۆمەلەك ژ بەرهەمێن کۆمڤەکری یێن عەرەبێ شەمۆ ١٩٦٩.

---

١-ڕەبەن: هەژار.

٢-بەربانگ: بەیانی ، سپێدە.

٣-رۆمان: چیرۆکا درێژ، ریوایە.

ئەگەر عەرەبێ شەمۆ ب بەرهەمترین وب ناڤ ودەنگترین نڤیسەرێ کوردێ سۆڤێتی بیت ئەڤە حاجی جندی، جاسمێ جەلیل، ئەمینێ ئەبدالٚ، موسەیێ ئاخۆندۆڤ، باخچۆیێ سلۆ، ڤاچاغێ مراد، . . . هتد ب هۆزانڤان و نڤیسەر ناڤێن وان دەرکەڤتینە وخزمەتەکا زۆر بۆ زمانێ کوردی کرینە. هەروەسان ب کۆمکەرێن سامانێ دەوڵەمەندێ فۆلکلۆرێ نەتەوێ خۆ ب ناڤ و دەنگن.

پێدڤی یە ئەوێ چەندێ ژی ل بەرچاڤ وەربگرین کو مەزنترین کار بۆ تومارکرنا فۆلکلۆرێ کوردی و وەرگێڕانا وی بۆ ئەرمەنی و ڕووسی ل ئێکەتیا سۆڤێت دا بوویە و ژلایێ زانایێن وی وڵاتی ڤە بوویە.

حاجی جندی وئەمینێ ئەبدال خەباتەکا زۆر درێکا ساخکرن و ڤەژاندنا زمانێ کوردی ل وڵاتێ سۆڤێت دا کرینە، ب ڕێکا نڤیسینێن خۆ نەتەوەیێ کورد ب گەلێ سۆڤێتێ وب گەلێن دی دایە نیاسین، هەروەسان ب هاریکاریا ئێك دوو چیرۆکا (لازۆ) ژ ئەرمەنیێ وەرگێرایە سەر زمانێ کوردی، ئێك ژ پلەیێن گرنگێن گەشەکرنا ئەدەبیاتێن کوردێن سۆڤێتێ ب بەلاڤکرنا کۆمەلا (فولکلۆرێ کوردی) دەست پێ دکەت کو ل سالا (١٩٣٦ز)ێ دا ل یەریڤانێ هاتییە چاپکرن، دڤێ کۆمەلێ دا گەلەك باس وەك خۆشەویستی وبارێ خێزانا کورد و ڕەوشا ژنان و دەسهەلاتا سەرتیرە و خودان دەسهەلات، جهێ شیربایێ[1] دژیانا خێزانێ دا، مێڤانداری، زیرەکیا کوردان . . . هتد ڕەنگ ڤەدایە.

---

(١) شیربایی: ڤەلەن ، هەق.

د ئەدەبیاتێن کوردێن سۆڤێتی یێن ڤی سەردەمی دەنگێ هۆزا لیریکی[1] وبابەتێ داستان ئامێز دیارە. دبەرهەمەکێ حاجی جندی د اکو ناڤێ وی (شارێ) بوو، بەحسێ یاسایا دانەشوی و شیربایێ دکر کو هەتا سەردەمێ شۆرەشا ئۆکتۆبەرێ ل چیاییێن پشت قەفقاسدا دناڤ بابکێن کەڤن دا مابوو. د وی بەرهەمی دا ناڕەوایی و سەختیا پەیڕەوێ کەڤن ب رۆخسارەکێ هۆنەرمدانە دەبڕییە. ئادگارێ[2] (شارێ) کو قۆچێ قوربانێ دەستێ شیربایێ یە بەرامبەر وی بابێ پیرێ کو ب دەستێ خۆ کچا خۆ یا خوشەویست بەرەڤ مرنێ دبەت، هەوارەکە بەرامبەر وێ ڕەفتارا کەڤن. هۆزانڤان گەلەك سادە بەحسێ ئازاردانا کچێ ودانەشوی یا ب زۆری دکەت کو ئەڤە دکەڤندا سەر ئەنجامێ هەر کچەکا کورد بوویە.

ئەدەبیاتێن گەلێن سۆڤیتێ و دەوروبەران کارتێکرن کرییە سەر ئەدەبیاتێن تازەیێن کوردی. دبەرهەمێن تازەیێن نڤیسەران دا بەحسێ دۆزێن ڤی چەرخی دێ بینین، وەکو د وێ کۆمەلا شیعریدا دا دیار یا کو هاتیە ناڤکرن ب (شاعیرانی کوردی سۆڤێت، یەریڤان، ١٩٥٦) یان دکۆمەلا (ڕێگای نوێ)دا (تبلیسی ١٩٥٨) یان دکۆمەلە هۆزانێن هۆزانڤانێ کورد باخچۆیێ ئیسکۆدا (تبلیس ١٩٦١) دیارە. دەستەکا کەڤنا هۆزانڤانێن کوردێن سۆڤێت پێکڤە کۆمەلە هەلبەستەك دەرئێخستن کو هۆزانێن ئەمینێ ئەبدالێ و یوسفێ بەکۆ و جاسمێ جەلیل و حاجی جندی و وەزیرێ نادری تێدا بووینە. پشتی ئەڤان

---

(١) لیریك: سۆزی، هەست لڤین.

هۆزانڤانێن کوردێن گورجستانێ کۆمەڵە هەڵبەست چاپ کرن پێکهاتی بوون ژ بەرهەمێن جەلیلێ ئاجۆ، ئادۆیێ جەنگۆ، مۆرۆیێ مەمەد، ڤاچاغێ مراد، باخچۆیێ سلۆ.

دگەل ڤان بەحسا کو ژ ئەفسانێن خەلکی هاتینە وەرگرتن، هەردیسان رەنگڤەدانا ڕویدانێن ژیانێ تمام ئەڤ هۆزانە وەلێ کرینە کو ژ ژیانا کوردێن سوڤێت دا رەنگڤەدانا ژیانا تازە و کوردێ ئەرمەنستانێ پشکەکا زۆر ژ هۆزانێن ئەمینێ ئەبدال و ئادۆیێ جەنگۆ و عەزیزێ سلۆی بەرکەڤتینە.

هەر وەکی جەردۆیێ گەنجو بۆ مە دکێشیت، دهەمی بەرهەمێ کەڤن وتازەدا یێن هۆزانڤانێن کوردێن سۆڤێتدا دگەل وان بەحسێن هاتینەکرن سۆزەکا تایبەتا خۆشەویستیا نەتەوەیێ کورد دهێتە دیتن. سۆزا کوردەکێ خۆ گرێدای ب مێژوو و سەرفەرازی و ئازاییا خەلکی، سۆزا کوردەکێ کو هەست ب هەمی رابردوو و نوکە ژیانا کورد بکەت.

ئەدەبیاتێن کوردێن سۆڤێت بەرەبابەکێ تازە ژ شاعرو نڤیسەران پێگەهاندییە، ژوانا: میکایلێ رەشید، ڤاچاخی مراد، عەزیزێ سلۆ، عەتارێ جەردۆ، کارلینێ چاچان، شکۆیێ حەسەن، ئۆردیخانێ جەلیل وچەند شاعرێن دی کو کۆمەڵە هۆزان ل تبلیس و یەریڤانێ چاپ کرینە.

دڤان سالێن دیماهیێ دا بەرهەمێ نڤیسەرو هۆزانڤانێن کورد ب هژمارەکا زۆر ژ گەلێن ئێکەتیا سۆڤێت هاتنە راگەیاندن، ئەڤەژی ب رێیا وەرگێرانێ ژ زمانێ ڕووسی و گورجی و ئەرمەنی و ئازەربیجانی و زمانێن دی. هەروەك

نڤیسەرو هۆزانڤانێن کورد وەرکرین کو گەلێ کوردێ سوڤێتێ ب زمانێ خۆ بەرهەمێ تۆلستوی و پوشکین و لێرمەنتۆڤ و کریلۆڤ و هۆزانڤان و نڤیسەرێن دی بخوینن.

ئەگەر تاکە رەخنەیەك ل هۆزانڤانێن کوردێن سۆڤێت بهێتە گرتن ئەڤەیە کو هۆزانڤانێن وان ژبەر وێ رەوشا مێژوویێ ئەوا مە بەحس کری، ل سەر بناغێ موکم و رەنجا سەدان سالێن ئەدەبیاتێن کلاسیزمیێ کوردی نەهاتییە دامەزراندن، ژبەر ڤێ ئەگەرێ زۆر جار ساکاری و سادەیی دزمان و دەربڕینێ دا دهێتە دیتن و ئەو تام و خۆشیا ئەدەبیاتێن کلاسیزمیێن کوردی تێکەلی بناغە و رەگەزێن هۆزانا وان نەبوویە، ئەڤە بۆ هۆزانێ، لێ دچیرۆکێ دا ڕەوشا ئەوان و پێشکەفتنا وەلاتی وەکر کو گەلەك رەگەزێن هونەری یێن چیرۆك نڤیسینا رۆژئاڤای تێکەلی بەرهەمێ چیرۆکێن وان ببیت و تشتەکێ نوی و ب بها پەیداببیت.

ئەڤە بەحسێ مێژوویا ئەدەبیاتێن کوردێن سۆڤێت بوو، لێ ئەگەر مە بڤێت هەمی چالاکیێن رووناکبیری و کولتورێ کوردێ سۆڤێت بەحس بکەین، ئەڤە دگەل هندێ کو بەحسێ هۆزانڤانێن وی سەردەمی وڤی سەردەمی یێن وی وەلاتی بکەین پێدڤی یە لنك گەلەك بەحسێن دی بۆ راوەستین کو هەر ئێك ژوان زۆر نیشادان و ڤەکۆلێن دڤێت، وەك:

١-پەیدابوون و بەرەڤ پێش چوونا پەرتووکا ڤوتابخانێ.

٢-ڕۆژنامەگەری و ڕۆلێ رۆژنامێ (ڕێیا تازە).

٣-زمانەڤانی و ڤەکۆلینا زمانێ کوردی.

٤-فۆلکلۆرێ کۆمکرنێ و ڤەکۆلین.

٥-دەست نڤیسێ کوردییێ کەڤن ولێ وردبوونا وەرگێرانێ وچاپکرنێ.
٦-نڤیسینا مێژوویا کورد و ڤەکۆلینێن وێ.

ئەڤە و چەند مەیدانێن دی گەلەك ناڤ دێ دیاربن کو هەر ئێك ژوان وانێن تایبەت دڤێن، لێ وەك هوین دزانن بەحسێ مە یێ نهو ب شێوەیەکێ کورت بۆ ئەدەبیاتان هاتیە تەرخانکرن.
ئەگەر کەسەکی بڤێت دشێت دگەلەك ژێدەران دا ل دویڤ ئەڤان بەحساندا بگەڕیێت.

دیماهیك تشت دڤێت بهێتە گوتن ئەڤەیە کو ئەڤ بەرهەمێن مە بەحس کرین هەمی دبنەڕەتدا ب کرمانجی ژووروو هاتینە نڤیسین وتشتەکێ تێکەل ژ پشکا (هەکاری و بۆتانی و بایەزیدی). لێ بەرەڤ پێش چوونا تایبەت وەلێ کرییە کو ژ بناغێ کلاسیزمیێ کرمانجییا ژووری یا دووربیت ل جهێ پەیڤێن عەرەبی و فارسی و تورکی و زاراڤێن دی ژی دا ب تایبەت پشتی شۆڕشا ١٤/تەمموزا/ ١٩٥٨ یا عیراقێ ڕووناکبیرێن کوردێن سۆڤێت، چ ئەو ب خۆ . . وچ دبەرهەمێن خۆدا ژ گەشەکرنا ئەدەبیاتێن کوردێ عیراقێ نەهاتینە دابڕین.

# جاسمێ جەلیل

هۆزانڤان و نڤیسەر و چیرۆك نڤیس جاسمێ جەلیل ل سالا (١٩٠٨ز) ل گوندێ (قز یلقۆلی) سەر ب باژێرکێ (دیگۆرێ) قەزا (قەرسێ) ل ئێکەتیا سۆڤێتاجاران ژدایك بوویە. د ژیێ دەهـ سالیێ دا (٤٠) تا (٥٠) کەس ژبنەمالا وان دکەڤنە بەر هێرشا تورکان وهەمی دهێنە کوشتن، بتنێ جاسمێ جەلیل نەبیت کو وی دەمێ هێرشێ ئەو ل چیای بوو، شڤانێ بەرخان بوو، دماوێ ژیانا خۆدا گەلەك نەخۆشی وتالی وبێکەسی دیتییە، ماوەیەکێ دگەل هزاران زارۆیێن بێ چاڤدێرێن دی یێن کوردو ئەرمەنێن وەك وی دخانا ئێتیماندا دژیت. ل باژێرێ (باکۆ) دەست ب خواندنێ دکەت و ژبەر زیرەکیا وی دهێتە ڕەوانەکرن بۆ خواندنا بلند یا لەشکری ل باژێرێ (تەفلیس).

ل ژیێ (٢٣) سالی دا جاسمێ جەلیل دهێتە دەست نیشانکرن بۆ خزمەتکرنا بزاڤا رەوشەنبیریا کوردی ل ولاتێ ئەرمینیا، ئازەربێجان - گورجستان کو دەرفەت بۆ خواندن و نڤیسینا کوردی ب رێنڤیسا لاتینی هاتییە دان، ئەڤە ژی وەك ناڤەندەکا رەوشەنبیری بوویە بۆ پێگەهاندنا قوتابیێن کوڕ و کچ یێن کورد ل هەمی کۆمارێن ئێکەتیا سۆڤیتێ بەرێ خۆدایێ. ل سالا (١٩٣٢ز)ێ جاسمێ جەلیل دبیتە بەرپرسێ سەرەکیێ ئامادەکرن و چاپکرنا پەرتووکان ب زمانێ کوردی. ل سالا

(١٩٣٨-١٩٤١ز)ێ ل یەریڤانێ ل ئەنستیتۆیا نێڤ دەولەتی (کولیژا زمانەڤانی) زمان و ئەدەبیاتان دخوینیت و ب سەرکەفتی دەردچیت.

پاشی بۆ ماوێ (٣) سالان ل ئەنستیتۆیا (ماف) دخوینیت و دیبلۆما دووێ یا خواندنا بلند وەردگریت، ماوەیەکێ دبیتە مامۆستاییێ زمانێ کوردی ل قوتابخانا لەشکەرێ تایبەت ل ڕووسیا. ژیان و خەباتا ئەڤی رەوشەنبیری گەلەك ب نرخ بوو، ناڤێ جاسمێ جەلیل وەك رەوشەنبیرو هۆزانڤانەکێ کورد ل وەلاتێن ئەرمەنستان و ڕووسیا و ئۆکرانیا ئاماژێ پێ هاتیە دان. ل سالا (١٩٦٣ز)ێ بوویە ئەندامێ ئێکەتیا نڤیسەرێن سۆڤێت وگەلەك جاران بوویە نوینەرێ ئێکەتیا نڤیسەران ل کۆنفرانس و کونگرەیێن مۆسکۆ، دبیاڤێ هونەری ژی دا جاسمێ جەلیل شیا (٧٠٠) ستران و ئاوازێن کوردی ل رادیۆیا یەریڤانێ تۆمارو بەلاڤەبکەت، ئەڤەژی وەك بنیاتەکێ موکم و زێرین بوو بۆ پێشکەفتنا مۆسیقا و هونەرێ کوردی. جاسمێ جەلیل ئێك بوو ژ وان کەسان کو بنیاتێ ئەدەبیاتێن کوردی ل سوڤێتییێ دانایـن، وپتریا هۆزانێن وی هاتینە وەرگێران بوو ڕووسییێ وب رێکا ڕۆژنامەیێن (پراڤدا) و (ئەزڤیستیا) هاتینە چاپ کرن و بەلاڤەکرن. جاسمێ جەلیل باشترین و بژارەترین بەرهەمێ بیانی بۆ سەر زمانێ کوردی وەرگێرایە بۆ هندێ داکو خوینندەڤانێ کورد مفای ژێ وەربگریت.

جاسمێ جەلیل وەك کورد پەروەرەك ل دەمێ کیمیا بارانکرنا باژێرێ هەلبجە وەك کوردەکێ برینـدار ب رێکا نامەیەکا ڤەکری بۆ سەرۆکێ وی دەمی یێ سوڤێت داخواز حکومەت و سەرکردایەتیا سۆڤیتێ دکەت هەلۆیستی نیشابدەن سەبارەت کارەساتا هەلبجە. جاسمێ جەلیل (٧٠) سالێن پڕ خەبات وتێکوشان و ماندوو بوون ژ پێخەمەتی بەرەڤ پێش برنا

ئەدەب و رەوشەنبیریا کوردی ل سۆڤێتا جاران ب وی پەڕێ دلسۆزی و ژێهاتنێ کار تێدا کرییە، لێزانی و شارەزاییا ڤی کەسی هەمی دەرگەهێن هونەر و ئەدەب و رەوشەنبیریێ بخۆڤە گرتینە، لێ جهێ داخێ یە ئەڤ کەسێ بلیمەت ل سالا (١٩٩٨ز)ێ مالئاڤایی کر و ستێرەکا دی یا رەوشەنبیریا فەرهەنگا کوردی هاتە ڤەمراندن ول گۆڕستانەکێ ل نێزیکێ باژێرێ یەریڤان هاتییە ڤەشارتن. ئەڤ بەرهەمە ئەون یێن کو جاسمێ جەلیل بۆمە هێلاین

(رۆژێن من، کەلامێ چیا، ئودا کوردا، زۆزان). ئەڤەژی ئێکە ژ هۆزانێن جاسمێ جەلیل ب ناڤێ:

## حوبا شڤان

١- شڤـــانی جاهـــل رۆحێ تە نـــازم
ڕۆحێ نـــازك وەك زارۆك بێچـــك
ڕۆحێ تە هەڤال، بۆی جەو کانیانە
رۆحی تە خوسیا کولیلك، کارزیانە

❖ ❖ ❖

٢-شڤـــانێ جاهـــل، زانم رۆحێ تە
زمـــانێ عەمـــر، تەبیـــەتێ زانــە
لێ وەختــا ئـەزم، ئـــەزم ل رەخ تە
دەبێی کلیتـــم ئـــەز بـــوێ زارێ تە

٣- ئو تو بەنـــد دبـــی زمان لا لۆمـــە
بەڵی فەعم دکەم ئەز ژ رۆحـــێ تە
بەلێ، کێم دبهێم خەبەرێ تە دوور
حەزنا فکراتە، بەحرا بی بوو حوور

❖ ❖ ❖

٤- زانـــم بلـــوورە، بلـــوورە زارێ تە
ســـەر وی دلێزن تـــلی پێچی یێ تە
سەوت و مـــەقـــام لێ دبنە کـــانی
حوببـــا تە ئۆکیـــان، ئۆکیانە ئەینی

❖ ❖ ❖

٥- لێ وەختـــا من راتوو خەبـــەری ددی
لێڤـــێ تـــەنـــازك، نـــاز درجـــفن
وەختـــا بلـــووری تـــو کـــو هـــەلددی
حووب، سەوت و مەقام چەمکی دکێشن

❖ ❖ ❖

٦-خـــوو ئـــاڤا ل سەر گول و ســـۆســـەنا
ب ئـــەڤینتیـــا ئـــەو واندا دنـــچە
کەرێ پەز مووتـــاج مینـــا تە ئەڤینا
چێـــری بیـــردکە، دوور تـــە دچڤـــە

٧- تـــەنێ مرازەك دلى مندانـــە

حازى ببوومـا بلوورا دەستـــاتە

حـــويب و ئەڤينتيـا دلێ تەدانە

من نجـاندا نـــاب وان تـــلى تە

❖ ❖ ❖

٨- وى چاخى ئەزێ نەمر بمێنم

بێ منەت، بژيم مينـــا تەيـــرەوا

كوو سەر لێڤى تە تمێ بلووربـــم

ئوببم كانيـــا سەوت و مەقــاما

(بتنێ چوار كۆپلە ژدەسپێكێ بۆ ژبەركرنێنە)

## لێكدانا پەيڤان:

جاهل : جحێل، لاو.

بێچك : بچووك.

جه : جۆگە.

خوسيا : ڕاهاتوو.

کارزیان : بەرخ زان

عەمر : تەمەن ، ژی ، هەموو ژیان.

تەبیەتێ : تەبیعەتی ، سرۆشت (پەیڤا عەرەبی یە).

زانە : دزانیت.

لەرەخ تە : ب رەخ تەڤە.

دەبێی : دێ بێژی.

زارێ تە : زمانێ تە.

تۆ بەند دبی : تۆ ڕادوەستی.

فەعم دکەم : فەهم دکەم، تێ دگەهم.

دبهێم : دبیستم.

خەبەر : ئاخفتن ، قسە.

بی بوو حوور : بێ کۆتایی ، بێ دیماهی ، بێ پایان.

دلێزن : یارییێ دکەن.

ئۆکیان : ئۆقیانووسی.

ئەینی : هێمن.

درجفن : درەجفن.

دنچە : دچیت.

مینا : وەك.

مووتاج : موحتاج ، پێدڤی.

چێرێ : ماوەیەك.

دچڤە : دلڤیت.

مراز : هیوا ، هیڤی.

ڤازی : خۆزگە ، خۆزی.

وی چاخی : وی دەمی.

تمێ : هەمی ، تمام.

# پەخشانا کوردی

پەیڤا پەخشان وەکی دفەرھەنگێ دا ھاتی ژ پەیڤا ((پەخش)) ھاتییە وەرگرتن کو ب رامانا (بەلاف) دھێت، و وەکی زاراف ژی پەیڤا پەخشان بۆ وان بەرھەمێن ئەدەبی و زانستی بکاردھێت کو نەکەڤیتە قالبێ کێشی و سەروایێ و زمانێ ھەلبەستێ. ئاشکرایە ئێکەم دابەشکرنا ئەدەبێ ژلایێ رووخساری ڤە ئەدەبێ دکەتە دوو جۆر:-

**(ھەلبەست و پەخشان):** گەلەك ژ کەڤن وەرە ھەلبەست و پەخشان ھەبووینە و نموونەیێن ھەردوو جۆران ژی بۆمە ژ سەردەمێن کەڤن ماینە، ئەگەر چ دپتریا ئەدەبێ نەتەوەیان دا پەخشان کێمتر بوویە وھەلبەست پتر بوویە، لێ دڤی سەردەمی دا ھەلبەست پتر بکاردھێت بۆ نڤیسینا ھونەرێن (جۆرێن) ئەدەبی، لێ ئەرێ ھەلبەست یان پەخشان کەڤنترە؟ دڤی بواری دا دوو بۆچوونێن جودا ھەنە:-

**بۆ چوونا ئێکێ:** دبێژیت ھەلبەست ژ پەخشانێ کەڤنترە. ئەو کەسێن ئەڤ بۆچوونە ھەین وپەسەند دکەن بەلگێن وان ئەڤەنە:-

١- ھەلبەست زمانێ ھەست و سۆزێ یە و ژ وژدانا ھۆزانڤانی دزێت، کو چ پەخشان زمانێ ھۆش وژیرییە و ژمێشکی پەیدادبیت،وژبەر ھندێ کو مرۆڤ ل پێشترێ ھەست و سۆزا وی دلڤیت و وژدانا وی دکەڤتە کاری پاشی ھۆش وھزرکرن گەشەیێ دکەت وپێدگەھیت و دەستھەلات ب سەردا پەیداکرییە،

ب ڤێ چەندێ پێدڤی یە هەڵبەست بەری پەخشانێ هات بیت.

٢-هەڵبەست ژبەر کێش وسەروا و ئاوازا وێ و ژبەرکرنا وێ ب سانەهی یە و دشێت خۆ بپارێزیت وەك خۆ بمینیت، بەلێ پەخشان ژبەرکرنا وێ یا گرانە و ڕاگرتنا دەقێ وێ گرانترە، ژبلی هندەك پەخشانێن کورتێن سەروادار دکێشەدار وەکو گوتنێن مەزنان و پەندێن پێشینان.

٣- ل لایێ هەر نەتەوەیەکی کەڤنترین دەقێ ئەدەبی مابیت هەڵبەستە نەك پەخشانە، وەکو داستانا گلگامیش یا سۆمەری وئەلیادە و ئۆدێسای هۆمیرۆسێ یۆنانی و درامایێن ب ناڤ ودەنگێن یۆنانی کو هەمی ب هەڵبەستێ بوون.

**بۆچوونا دووێ:** دبێژیت پەخشان بەری هەڵبەستێ هاتیە. لایەنگرێن ڤێ بۆ چوونێ ئەڤ بەلگەیێن هەین:-

١- مرۆڤی بۆ ئێکەم جار ول دەسپێکێ دەمێ ئاخفتی ب ئازادی هەست و هزرێن خۆ دەربیڕینە، پاشی هەولدایە ئەوان هەست و هزران بێخیتە دناڤ قالبەکێ ب کێش وسەروادار، ل جیهانێ دا تشتێ ئازاد بەری تشتێ دەستووربەند دهێت، ژبەر هندێ پەخشان کەڤنترە چونکی یا ئازادەو هەڵبەست ددویڤ دا هاتییە چونکی ل دویڤ دەستوورەکێ تایبەت دهێتە دارشتن.

٢-ل سەردەمێ هەرەکەڤن دا پەخشان (پەخشانا سەروادار) ل پەرستگەهان بکارهاتییە، و پەرتووکێن ئاسمانی ژی هەمی ب پەخشان هاتینە نڤیسین، ژبلی هندێ ژی نڤیسینێن کورتێن سەر دەرگەهـ و دیوارێن کۆشك وکەلهێن کەڤن وکێلێن گۆرستانا ب پەخشانێ بوویە، ژبەر هندێ پەخشان کەڤنترە ژ هەلبەستێ.

کیژ ژڤان هەردوو بۆچوونان؟ زەحمەتە ئەڤ بابەتە بێتە ئێك لاکرن کانێ هەلبەست یان پەخشان کەڤنترە، لێ لایەنگرێن بۆچوونا ئێکێ پترن وبەلگەیێن وان بهێزترن. دناڤ ملەتێ کورد ژی دا کەڤنترین بەرهەمێ ئەدەبی کو هاتبیتە نڤیسین تانهو مابیت ب هەلبەست هاتیە نڤیسین نەك ب پەخشانێ. دویر نینە رۆژەکێ دەڤەکێ ئەدەبی یێ هەلبەستێ یان یێ پەخشانێ یی گەلەك کەڤنتر بێتە ڤەدیتن، ئەڤەژی تشتەکێ دی یە.

## جوداهی دناڤ بەرا هەلبەست و پەخشانێ دا :

هەلبەست و پەخشان وەکو دوو شێوەیێن نڤیسینێن ئەدەبی ژ گەلەك لایان ڤە دژێك جودانە. گرنگترین جوداهی ژی ئەڤەنە:

١- هەلبەست ژ وژدان وسۆزێ دزێت، وپەخشان دەرئەنجامێ هۆش وژیروهزرکرنێ یە، ئانکو هەلبەست دگەل دل و وژدانا مرۆڤی دئاخڤیت و هەولێ ددەت بلڤینیت، وپەخشان دگەل ئەقل و هۆشێ مرۆڤی دئاخڤیت وهەولێ ددەت ب ژیربێژی و وردەکاری راستەڤینەیان بێخیتە

بەردەم، هەر ژبەر ڤێ چەندی ژی دهەڵبەستێ دا پتر کەساتیا هۆزانڤانی تێدا دیارە، وپەخشان کێمترە کەساتیا نڤیسەری دەردئێخیت.

٢- زمان و دەربڕین دهەڵبەستێ دا یێ لێکدایی و ئاوێتەیێ یە (تەرکیبی یە)، لێ دپەخشانێ دا یێ شیکاری یە (تەحلیلی یە)، چونکی هەڵبەستێ پێویستی ب چڕیا دەربیڕینێ و کورتبڕیێ هەیە، لێ پەخشانێ پێویستی ب شرۆڤەکرن و راڤەکرن و درێژەپێدانێ و لێکدانێ هەیە.

٣- کێش وسەروا دوو رەگەزێن سەرەکی و دیارن دهەڵبەستێ دا ب تایبەتی هەڵبەستا کەڤن، کەچ ئەڤە دپەخشانێ دا مەرج نینن، بتنێ دهندە پەند و گوتنێن مەزندا سەروا یا هەی، ئەوژی بۆ جوانی و ب سانەهیکرنا ژبەرکرنێ.

٤- دهەڵبەستێ دا گەلەك جاران کێش وسەروا هۆزانڤانی نەچار دکەن رێزبەندیا پەیڤان درستێ دا تێك بدەت و پەیڤان پێش وپاش بکەت، ژبەر هندێ ل هۆزانڤانی ناهێتە گرتن کو پەیڤ ل جهێ وێ یێ دروست نەدانابیت، ئەڤە ژی دبیتە ئەگەرا هندێ کو دارشتنا رستێ نەیا سرۆشتی بیت، لێ دپەخشانێ دا رێزبەندیا پەیڤان یا دروستە وهەر پەیڤەك ل جهێ خۆیە، ژبەر هندێ رستە د پەخشانێ دا رەوانتر و ئاسایترە ژیا هەڵبەستێ.

٥-نەخشێ دابەشبوونا هەر ئێك ژ هەڵبەست و پەخشانێ ل سەر بەرپەری دژێك جودانە، واتە تۆبۆگرافیا یا دەقێ هەڵبەستێ جودایە ژیا پەخشانێ، دهۆزانا کلاسیزمی دا هەر دێرەك ب سەر دوو قەدا دابەش دبیت وسەروا ل دویڤ جۆرێ هەڵبەستێ دهێتە گوهورین، غەزەل وقەسیدە و چوارین و مەسنەوی و موستەزاد . . . هەر ئێك ژوان جۆرە سەروایەك هەیە ورەنگەكێ نەخشەی ددەتە هەڵبەستێ ل سەر

بەپەری، لێ پەخشان هەمی ب سەر ئێك ڤە دهێتە نڤیسین وبتنێ ب تمام بوونا پارچەیەکێ دێرەکا نوی دەست پێ دکەت.

## جۆرێن پەخشانێ

### پەخشان ژلایێ ناڤەروکێ ڤە دبیتە دوو جۆر:

١-پەخشانا هونەری. ٢-پەخشانا زانستی.

١- پەخشانا هونەری: وان پەخشانێن ئەدەبی ڤەدگریت کو هەست و سۆزا نڤیسەری نیشاددەت. نڤیسەر دڤی جۆرێ پەخشانێ دا ل دویڤ دیتنا خۆ وتایبەتمەندیێن خۆ سەحدکەتە ژیان و کۆمەڵ وسرۆشتی. ئەڤ جۆرە پەخشانە خۆ ژ بابەتێن (مەوزوعی) وەکو ئابووری و زانیاری گشتی وهتد دویر دئێخیت. پەخشانا هونەری وەکو (وتارا ئەدەبی، چیرۆك، کورتە ڕۆمان، رۆمان . . . ) ب خۆڤە دگریت، ئەڤ جۆرە پەخشانە پێدڤی ب شێوازەکێ بەرز هەیە، پەیڤێن وێ د ژێگرتی بن و دارشتنا وێ یا موکم بیت.

ئەڤ جۆرێ پەخشانێ ژلایێ ڕووخسارێ ڤە دبیتە دوو جۆر:

ئـ-پەخشانا سەروادار. ب-پەخشانا ڕەوان

**ئـ- پەخشانا سەروادار:** ئەو پەخشانا هونەری یە کو بەشێن ڕستەیێن وێ دوو دوو سێ سێ یان پتر د هاوسەروابن، وئەڤ سەروایا وێ نێزیکێ هەڵبەستێ دکەت، وهندەك ژوان کەسێن باسی دەستپێکێن هەڵبەستێ دکەن دبێژن ژ پەخشانا سەروادار

یا گەشەکری وپێشکەفتی وپی گەهشتی، کو ئەڤ پەخشانە ل پەرستگەهان یا بەلاڤ بوویە، نموونا پەخشانا سەروادار ئەڤ پارچە نڤیسینا (عەلائەدین سوجادی)یە، دەمێ باسی مەلایێ جەباری دکەت، دبێژیت:

((پیری مەیخانەی خەیاڵ شناسان، بادە ئەنۆشێ لە جەرگەی خاسان. ڕشتەی مرواری قسەو باسیە، نەواتی قومرییان وێنەی ڕازییە. بێنی هەناسەی شنەی شەماڵە، تێکەل بەبیری بەرزی خەیاڵە . . . )

((بۆ ژبەرکرنێیە))

دڤێ جۆرە پەخشانێ دا پێدڤی یە هەر چەند رستەیەك ب ئێك سەروا دیماهی بێن، لێ درێژاهیا وان رستەیان یان ژمارا وان گرنگ نی نە.

**ب- پەخشانا ڕەوان:** ئەڤ جۆرێ پەخشانێ گرنگیێ نادەتە سەروایێ دپارچێن رستێ دا. نڤیسینا وێ ب رەنگەکێ رەوان وبێ گرێ وبێ ئالۆزی یە. پەخشانا رەوان پێدڤی یە ژ تێگەهشتنەکا بەرفرەه و خەیالەکا ئازاد و دارشتنەکا موکم هات بیت، ئەگەر نە جهێ خۆ ناگریت.

نموونا پەخشانا رەوان وەکو (شاکر فەتاح) د (ژینی نوێ)دا دبێژیت:

(جیهان بەرەو چاکی ئەڕوا: لە گەل ئەم هەموو شەڕو شۆڕو بەدکردارییەشدا کە ئیمڕۆ لە جیهاندا ئەیبینین، من باوەڕم وایە کە جیهان بەرەو چاکی ئەڕواو دوایی هەر ئەگاتە ئەو ئامانجەی ئاواتی بۆ ئەخوازین، واتە بێتە یەك خێزان لەناو یەك خانوودا، بەلام خێزانێکی بەختیار لە خانوویەکی ناوازەدا...) ((بۆ ژبەرکرنێیە))

ئەڤ پارچە نڤیسینە ب کوردیەکا پەتی ورەوان بەحسێ ژناڤ چوونا شەڕی و بەدکاری و سەقامگیر بوونا ئاشتی و ئاسایشێ دکەت. نڤیسینا وی وەکو ئاڤەکا زەلال جوان هێدی دچیت، و خویندەڤان هەست ب هیچ گرانی و ئالۆزیەکێ ناکەت.

**٢- پەخشانا زانستی:** ئەو پەخشانەیە کو ب رەنگەکێ بابەتی یێ مەوزوعی بەحسی راستیێن زانستی دکەت، هەر زانستەکی: بیرکاری، فیزیا، کیمیا، جوگرافیا . . .هتد.

زمانێ ڤی جۆرێ پەخشانێ یێ دویر ژ دووبارەکرنێ و هونەرێن رەوانبێژیێ. ئەڤ جۆرە پەخشانە ناکەڤیتە بن کارتێکرنا هەست و سۆزێ نڤیسەری، وهەردیسان هەست وسۆزێ خویندەڤانی ژی یێ نالڤیت، ب رێکا پەیڤێن پێدڤی بابەتەکێ زانستی راڤەدکەت و روون دکەت.

نموونەیەك بۆ پەخشانا زانستی وەکو (مەحموود نوری قەرەداغی) دباسی کۆمپیوتەری دا دبێژیت:

(میشکی ئەلکترۆنی پێك هاتوو لە مارەیەکی گەلێ زۆر لە بەربەستەی (ڵمام) ئەلەکترۆنی یان ترانسستەرو لە پارچەی زۆر وردی ئەلەکتریك کە کۆمەڵ داڕێژراون و کۆکراونەتەوە. زمانی ئەم ئامێرە لە وشەی (بەڵێ -و- نە و)، پتری نیە، بە مانای زانیاری ئەلکتریك، تەزووی ئەلەکتریك (بڕوا) و (نەڕوا) هیچ جۆرە ئامانجێك ناداتە دەست ئاگادارو سەرپەرشت نەکرێت . . . ) ((بۆ ژبەرکرنێیە))

دڤێرێ دا نڤیسەر گرنگیێ ب هەلبژارتنا پەیڤان نادەت، زمانێ خوازێ وخواستنێ وهونەرێن دی یێن رەوانبێژیێ بکارنائینیت، وهەوڵ نەدایە

رستەیان ژی ب وی ڕادەی ب رێك بێخیت، چونكی گەهاندنا زانیاریێ ژهەمی تشتەكێ دی گرنگترە، دگەل هندێ ژی ئەڤ چەندە لێ دهێتە گرتن كود شێت هەر ب وان پەیڤان رستەیێ رێك وپێكتر دروست بكەت ئەگەر پیچەك پەیڤان پێش و پاش بكەت. وب وێ چەندێ هندەك رستەیێن ڕەسەنتر دێ پەیدابن.

## هونەرێن پەخشانێ:

هونەرێن ئەدەبێ، ب هەردوو شێوەیێن وێ هەڵبەست و پەخشان، ژ كەڤن وەرە هەتا ئەڤرۆ گەلەك گۆڕانكاری ب سەردا هاتییە، د گەشەكرنا ئەدەبێ جیهانی دا هندەك هونەر شێوەیێ وان هاتییە گوهۆڕین وەكو هەمی درامایێن كەڤن یێن ب هەڵبەست و پەخشانێ هاتینە نڤیسین، هەر چەندە نهۆ بتنێ ب پەخشانێ دهێتە نڤیسین، یان هندەك هونەران دەورێ وان یێ ب سەرچووی و نهۆ ناهێنە نڤیسین وەكو داستانێن پاڵەوانەتیێ و دلداریێ، وهندەك دی ژنوی هاتینە داهێنان و ژیێ وان ژچەند سەد ساڵەكان پتر نینە وەكو كورتە چیرۆك و كورتە رۆمانێ و رۆمانێ، ژبلی ڤێ چەندێ ژی رۆژنامەگەریێ گەلەك هونەرێن نوی یێن پەیداكرین و گەشە یا پێدایی وەكو وتارا ئەدەبی و یاداشت و گاڵتە و . . . هتد

ئەڤە هندەكن ژ وان هونەرێن ب پەخشانێ هاتینە نڤیسین:

حیكایەت (ب هەمی جۆرێن وێ ڤە)، ئەفسانە، وتارا ئەدەبی، خوتبە، كورتە چیرۆك، رۆمان، كورتە رۆمان، شانۆگەری، ژیننامە، خاتیرە، ڤەكۆلین و رەخنەیا ئەدەبی، نامە، گاڵتە، پەندێن پێشینان، . . .

هەر ئێك ژڤان هونەران، مێژوویا پەیدابوون و وەرارا خۆ هەیە، هەر ئێكی دستوور وشێوازێ نڤیسینا خۆ هەیە و هەرئێكی جۆرێ تایبەتێ خۆ هەیە، ل دەم و جهێ واندا دێ بەحس لێ هێتە كرن.

## دەستپێكا سەرهلدانا پەخشانا كوردی:

دناڤ كوردانداژی، كو ژ وی میراتێ ئەدەبی بۆمە مای، هەلبەستە (هۆزانە)، كەڤنترە و چ جاران پەخشان ب وێ كەڤناتیێ نەبوویە. كەڤنترین پەخشانا كوردی كو هەتا نوكە هاتیە ڤەدیتن ولبەر دەستێن مەبیت، پەرتووكا عەلی تەرەماخییە كو ل سالا هزارێ یا مشەختی هەمبەری (١٥٩١-١٥٩٢ز) دژیانێ دا بوو. پەرتووكا وی ل دوور رێزمانا عەرەبی وفارسی وكوردییە، دبنەڕەتدا پەرتووك ب دوو ناڤان هاتیە دانان:

- هذا كتاب عبارة على ترماخی.
- هذا كتاب صرف لسان كردي.

پەرتووك ژ پێشەكییە كێ وسیە وئێك بەشان پێك هاتییە. چواردە بەشێن پێشییێ ل دوور رێزمانا عەرەبییە وشازدە بەشێن دویڤدا ل دوور رێزمانا فارسییە ول دوماهییا زۆربەیا بەشاندا هەمان بابەتێ وێ ب كوردی ژی بەحس كرییە، بەشێ دوماهیێ ژی بو دوماهیك (خاتمە) تەرخانكرییە.

زمانێ نڤیسینا پەرتووكێ كوردییە وپڕی پەیڤ و دەستە واژەیێن عەرەبینە. ئەو زمانە یێ كو مەلایێن كوردستانێ ل مزگەفتان وانەیێن زانستی وشەریعەتی پێ دگوتن.

## ئەڤەژی نموونەکە ژ پەخشانا تەرەماخی:

-فەسل د. بەحسا فیعلا موزاریعدایە: دزمانێ کورمانجیدا پێنج سیغە بدەر دکەڤن، زێدە نابی وەکو نها: (دچی)، (دچە)، (دچن)، (دچم)، (دچین). ئەفعالێدمایی ژی لڤان قیاس بکە . . . )

-فەسل دبەحسا ئەمری حازریدایە: بزمانێ کرمانجی دیسانی پێنج سیغە دئەمری حازریداژی دبە، مەسەلا وەکو نها: (بدە) یانی موفرەدی موخاتەبە، چەموزەککەر چەموئەننەسە (بدن) یانی هون تەسنیەو جەمعا غایبان چەموزوککەر چەموئەننەس، (بدم) یانی ئەز کو موتەککەلیمی وەحدەمە، (بدەین) یانی ئەم کو موتەکەللیم مەعەلغەیرین، ئەم (بدەین).

(هەمی بۆ ژبەرکرنێیە)

پ شتی عەلی تەرەماخی (عقیدة كردية) یا مەولانا خالد دهێت کو ب (ئاقیەی مەولانا) یان (ئاقیەی کوردی) ناسیارە، گومان تێدانینە کو مێژوویا وێ بۆ بەری ١٨٢٦/١١/١٧ ڤەدگەریێت، کو د وێ رۆژێدا مەولانا خالد چوویە بەر دلوڤانیا خودێ، ئەڤ (ئاقیە) بەحسێ پێنج روکنێت ئیسلامێ و شەش ژ بنەماییێن ئیمانێ دکەت، هەروەسا دەمێ دهێتە سەر بەحسێ (پرا قیامەتێ) دبێژیت:

(پردی قیامەت کە پردێکە لەمووبا ریکترە، لە تیغ تیژترە، بە ئەمری خودای تەعالا دەینێنە سەر پشتی جەهەننەمی، ئەمی دەکەنە هەمووان بەسەریدا ڕابوورن، هەر کەسێ بەهەشتی بێ، هێندێك وەك بروسکە، هێندێك وەك با، هێندێك وەك ئەسپی لنگ بەسەریدا

ڕادەبوورن. هەر کەسێ جەهەننەمی بێ پێی هەڵدەخلیسکێ دەکەوێتە جەهەننەمەوە، خودای تەعالا وەهای پێ موقەددەرە هەر کەس لەدنیادا لەسەر ڕێگای شەریعەتدا چاتر ڕابوردبێ، لەسەر پردی قیامەتدا چاتر ڕادەبووڕێ).

(هەمی بۆ ژبەرکرنێیە)

گرنگییا وی بەرهەمی د وێ چەندێدایە، ئێکەمین پێنگافە بو بجهئینانا داخوازیێن گیانی و کەلتووری و جڤاکێ کوردە واری ب زمانێ خۆ، هندەك تێبینی لسەر شێوازێ وی بەرهەمی:

- ئەو بەرهەم وێ چەندێ دیاردکەت، هەتا هینگێ هێشتا سلیمانیێ زارێ خو جهێ خونەبوویە، چونکی دەمێ باژێرێ سلیمانیێ هاتیە دامەزراندن خەلکێ گەلەك دەڤەرێن خودان زاراڤێن جودا جودا هاتنە باژێری و هەر کەسەکی ژوانا جورێ ئاخفتنا خو هەبوو، پشتی ماوەیەکێ زۆر ئەو زاراڤ تێکەلێ ئێك بووین، زاراڤێ نوکە خەلکێ باژێری پێ دئاخڤن دروست بوو.

- هندەك دیاردەو پەیڤ سازی دوی بەرهەمی دا هەنە دبنەجهێ لێ هویربوونێ، وەکی ب کارئینانا (دە) ل شوینا (ئە) یا کارێ نەبۆری. مانا (ت) ل دوماهییا کارێ نەبۆری بۆ کەسێ سێیێ تاك. بکارئینانا (دی) ل شوینا (تر) یا نوکەیا دەڤەرا سلێمانیێ.

-هندەك پەیڤ هەنە دیسان ب جورەکێ دی هاتینە بکارئینان، وەکو:

(بۆن) بوویە (بێن)، ( بچووك) بوویە (پچووك) . . .

پشتی ڤێ دەڤا پەخشانێ، بەرهەمێن مەلا مەحموودێ بایەزیدی دێ هێن، کو ل سالا ١٨٥٦و دویڤدا هاتینە نڤیسین، بۆ نموونە وەکی:

-مەم و زین ١٨٥٦

-عادات و ڕوسوماتنامەی تەوایفی ئەکرادیە و ئوسوولی نیزاماتی کرمانی، ١٨٥٨ - ١٨٥٩.

-جامع یێ رسالیان و حکایەتان بزمانی کورمانجی ١٨٦٠.

(مەم و زین)ا مەلا مەحموودێ بایەزیدی کورت کرنا (مەم وزین)ا ئەحمەدێ خانییە وب پەخشان و ب زارێ بایەزیدی هاتیە نڤیسین.

ئەڤەژی نموونەکە ژ دەڤێ وێ چیروکێ:

(دوێ وەقت و زەمانێدا، لەوان کناران، عادەتەکی قەدیم بوو کو سالێ جارەکی، دوەقتێ نەورۆزێدا سەری سالێ دکرن. وێ ڕۆژێ، ئەهلی و خەلکی باژێر حەموو، فەقیرو دەولەمەند، مەزن وبچووك، نێرومێ، عموومی، ژبۆ گەشت و گەڕییانێ، ب دەرڤە دچوونە دەشت و سەحرایێ. جنس جنس و ڕەف ڕەف، ژ دەرڤە ڕەسمی کەیفخۆشی نەورۆزێ ل وێ دەرێ ئیجرا دکرن، لورا وێ زەمانێ قسمێ تایفا ژنێد موسلمانان حەموو مەستوورە و ڤەشێرتی بوون، بەڕوویی نا مەحرەم وبیانیان نەدکەتن.

لاکن ڕۆژا کو ئەو عیدا نەورۆزێ دبوو، حیجاب و پەردە ژتایفا ژنان ڕادبوو، مێروژن وێ ڕۆژێ بە هەڤ خویا دبوون . . . )

( ژ دەسپێکێ هەتا دەشت و سەحرایێ بۆ ژبەرکرنێیە)

پشتی ڤان بەرهەمان وهەر ل سالا ١٨٦٠ شێخ حوسینێ قازی مەولوودنامەیا خو نڤیسییە کو پەخشانەکا سەروادارو ڕەوانەو ب زارێ کرمانجییا خوارێ (دەڤەرا سلێمانیێ) نڤیسییە. ئەڤەژی نموونەکە ژوێ مەولوود نامەیێ:

(حکایەت کراوە لەزەمانی ئەمیری ڕەشید- هاروونە ڕەشید - لەشاری بەسرە جوانێك هەبوو پیس وپەلید، لەفاسیقیدا شاگردی ئەوی بوو یەزید، ژ چاکەی نەبوو لەپاش ئیمان، فەقەت کە مانگی مەولوود دادەهات غەسل وتۆبەی دەکرد تەماعێکی لێ دەنا دەیخوێند مەولوودی حەزرەتی پێغەمبەری ئینس وجان. وەختێ کەمرد لەبەر خراپی یان فڕێیان دایە سەر گووفەکان، نەیانبردە سەرقەبران، بانگێك هات لە ئاسمان، ئەی ئەهلی بەسرە حازر ببنە سەر جەنازەی فلان جوان، کە وەلی ێیکە لە ئەولیای خوداوەندی ڕەحمان. ئەهلی شار جوان و پیرو پادشاو دەروێش و گەداو فەقیر، حازری جەنازە بوون دەفنیان کرد بێ تەئخیر. لە خەویان دیت ئەووەل شەو لەسەر تەختی بەهەشتی دانیشتییە ڕووی وەك مانگ دەدا پڕقەو، پێیان وت ئەتۆ لە دونیا زۆر فاسق بووی و ئەحمەق، بەچی سەبەب شادبووی بەحوورو قوسوورو لیباسی سوندوس وئیستبرەق، گوتی بەسەبەبی تەعزیمی مەولوودی ئەو حەزرەتەی کە بەئیشارەتی ئەنگوستی مانگی دەکرد شەق).

(ژ دەسپێکی هەتا پێغەمبەرێ ئینس و جان بۆ ژبەرکرنێیە)

## ئەڤ مەولوودنامە بەحسێ ڤان تشتان دکەت:

- چەوانیا دروست کرنا دونیایێ چونکە لسەر شەرەف پێغەمبەر (د.خ) هاتیە دروست کرن. (لولاك لولاك لما خلقت الافلاك)

-هندەك چیروکێن کورت تێدانە، مەزنی و کاریگەریا مەولوودا پێغەمبەری نیشامە ددەن، ئەڤ نموونا لسەری ئێکە ژوان چیرۆکان.

-بەحسێ چەوانیا ژدایك بوونا پێغەمبەری دکەت.

-ئەڤ مەولوودنامە ب پەخشان هاتیە نڤیسین و جارو بارا پارچە شیعرەك تێدا هاتیە هەلکێشان.

-زۆر بەر زۆرا وێ ب پەخشانا سەروادار هاتیە نڤیسین، گەلەك جارا ژی کومەکا دەستەواژە وڕستەیێن زۆر دبنە بەهاوسەروا.

-زمانێ وێ یێ پڕە ژپەیڤێن فارسی و عەرەبی. هەر ئەو زمانە کو شاعیرێن سەدێ نوزدێ یێن دەڤەرا سلیمانیێ شێعر پێ نڤیسین.

پشتی ڤان بەرهەمان کو پەخشان هاتیە نڤیسین ل بەربەرکێ دوماهیا سەدێ نوزدێ، پەخشانا کوردی دەرگەهەك بۆ هاتە ڤەکرن و ژهنگێ دویڤدا ب بەرفرەهی کەفتە بەلاڤەبوونێ و وەرارێ، ئەو دەلیڤە ژی ل ١٨٩٨/٤/٢٢ بوو ل ڤاهیرە و ژلایێ مەدحەت میقداد بەدرخانیڤە دەرچوو بۆ ماوێ چوار سالان بەردەوام بوو.

ئەڤەژی نموونەکە ژ پەخشانەکا ڕۆژنامەیا کوردستان:

(وەك ئەز دبهیسیم كوردا گەلەك دەولەمەند هەنە، گەلی دەوڵەمەندێن كوردا، بابێن وە ب دوگاز جاوی سپی چوون بەر ڕەحما خودێ، ئون ژی وی وەلی بچن لەوان زێڕو زیڤێن عولبەكرین وەدە دەرێخن، ڕێیا خودێدە مەكتە ب و مەدرەسا چێ كەن، زارویێن بێ دێ و باب بدن خوندن دا ئون دنیا ئاخرەتی ڕاحەت بكن، خودێ ژ وە ڕازی ببە. دەرێن ئەز لێ گەڕابیم من گەلەك مرۆڤێن دەوڵەمەند دیتنە زارویێن فەقیر دانە خوێندن ڕێ كرنە ئەستانبولێ، مەكتە ب و مەدرەسەیێن مەزن، نهۆ حەمی مەزن بینە، حەمی ژی مەئموورو زابتێن دەولەێینە . . .). (بۆ خواندنێیە)

ژهینگێ وەرە هەتا نوكە هەر چ رۆژنامە و گوڤارێن كوردی دەرچووینە، هەمییان رۆل د پێش ئێخستنا پەخشانا كوردیدا هەبوویە، چونكە رۆژنامەگەریا هەمی دونیایێ هەر پەخشانە و تنێ جاروبارا دەڤێن شیعری دهاتنە بەلاڤكرن ئەوژی رێژەیەكا زۆركێمە ل چاڤ هەمی نڤیسینین دی. ژبلی هندێ پەرەسەندنا زێدەتر یا چاپێ و چاپەمەنیان وەلێ كر پەخشان پتر گەشەو وەرارێ بكەت و هەمی هونەرێن پەخشانێ ب پەرتووك ژی بكەڤنە بەردەستێ خواندەڤانان . . .

دبەحسێ روژنامەگەریێدا، ڕۆلێ ڕۆژنامەیێ د وەرارا پەخشانێدا روونتر و باشتر دبیت، جۆرێن دی یێن پەخشانێ ژی وەكو وتار و چیرۆك و ڕۆمان . . . هەر ئێك دێ ل جهێ وێ بەحس لێ هێتە كرن.

# هندەك جۆرێن پەخشانان

## ١- گۆتار:

پارچە نڤیسینەکە ب پەخشان دهێتە نڤیسین، درێژییا وێ نەیا دیارو چەسپایە، دبیت پەخشان ئێك دوو لاپەڕبن و دبیت بیست سیە لاپەڕبیت، ب شێوازەکی ڕوون وب زمانەکێ پاك و رەوان بەحسێ بابەتەکی دکەت وبیرو باوەڕو هەست وسۆزا نڤیسەری دەردبڕیت. ژ هەمی جۆرێن ئەدەبی پێن دی نەرم و دەستخوشترە، تە چەوا بڤیت دێ وەسا هێتە بەردەستێ تە.

## کورتە مێژوویا گۆتاری:

هەر چەوابیت ڕەە و ریشاڵ و سەرەداڤا رەگەزێن نڤیسینا گۆتارێ زۆر دکەڤنن بو سەردەم وچاخێ یونانیان ڤەدگەڕێت، بەلێ بۆ جارا ئێکێ ددیرۆکێدا لسەر دەستێ مۆنتێنێ فڕەنسی (١٥٣٢ - ١٥٩٢) یاسا و بنەمایێن گۆتارێ پەیدا بوویە. ل وی دەمێ کو ل سالا (١٥٨٠) دوو بەرگێن گۆتارا ئەدەبی بناڤێ (هەوڵەکان Lesessaies) بەلاڤەکری. گۆتارێن مونتێنی ددرێژ بوون ودگەهشتنە چەند هزار پەیڤەکا، بارا پتر بابەتێن وێ ل دوور تشتێن وەکو: درەوکەران دەستوورێ جل و بەرگ و هونەرێ دوان و ستاندنا بوو. پشتی مونتێنی (باکۆن)ێ ئینگلیزی لژێر کاریگەریا مۆنتێنی دکۆمەکا گۆڤاران بەلاڤەکرن.

ل سەدەیێ هەڤدێدا، هندەك نڤیسەرێن وەکو سێر ویلیەم کورنوێلیر و نیکولاس بریتون و سێرتۆماس ئوڤەربێری دبیاڤێ گۆتار نڤیسینێدا وان

بەشداریەکا باش هەبوو، شوین تبلێن وان بنڤیسینا گۆتاران دیارو ئاشکرایە.

دسەدەیێ هەژدێدا، ژئەگەرێ دەرچوونا بابەتێن بەلاڤەکری و چاپەمەنیان، گۆتارا زێدەتر بەرەف پێش چوو، ریچارد ستایل و جۆزیف ئەدیسۆنی داهێنانەکا باش دنڤیسینا گۆتارێدا کر.

دسەدەیێ نوزدێدا بناغەیێ گۆتارێ موکمتربوو، ئەو بخو ژی دگەشە و وەرارێدا بوو، بابەتێن وێ بەرفرەهتر بوون و گۆتار نڤیس پتر بابەت و شێوازێن خو پەیرە ودکرن، چونکی ئەو سەردەم، سەردەمێ دەسپێکا رێبازا رۆمانتیکی بوو، دیارترین گۆتار نڤیسێن ڤی سەردەمی (لام و هازلت و دی کوینسی و ستیڤنسن) بوو . . .

ئەوا ژ هەمیان پتر گەشە و وەرار ئێخستیە گۆتارێ، دەرچوونا گۆڤارو رۆژنامە یان بوو، چونکی جهێ بەلاڤەبوونا گۆتارێ بارا پتر گۆڤارو رۆژنامە و بەلاڤکرینە، . . . دسەدەیێ بیستێدا، گۆتارا هەر دبەرەف پێشچوونێدا بوو و هەتا نوکە ژی گۆتار نڤیسینێ بهایێ خۆ ژ دەست نەدایە.

دناڤ کوردانلدا، نڤیسینا گۆتارێ ل گەلّ بەلاڤەبوونا رۆژنامەیی سەرهلدایە و خوجە بوویە، ئەگەر بەری نوکە رەگەزۆ بنەمایێن گۆتارێ دهندەك نڤیسیناندا هەبان ژی ب وی جۆری نەبوویە، ببیتە بابەتەکێ سەربەخۆ . . .

## جۆرێن گۆتـارێ:

گۆتارا ب شێوەکێ گشتی دوو جۆرە:

١-گۆتارا خودی (ذاتي).

٢-گۆتارا بابەتی (موضوعي).

یا ئێکێ زێدەتر پەیوەندی ب نڤیسەری بخوڤە هەیە و هەست و سۆزا نڤیسەری بسەردا یا زاڵە و کەساتیا نڤیسەری ب ڕوون و ئاشکرایی پێڤەدیارە، یا دووێ پێ لسەر لایەنێ بابەتێ دا دگریت و بزاڤێ دکەت بڕاستی بەحس بکەت، لەورا رێکێ نادەتە هەست و سۆزا خۆ تێکەلی نڤیسینا وی ببیت و کەسەکێ نڤیسەر دڤێ جۆرە گۆتارێدا دەرناکەڤیت.

## هندەك سیماییێن گۆتـارا بـاش:

١- گۆتار نڤیسینەکە، نەزۆرا کورتە و نەزۆرا درێژە، نێزیکی (١٠) لاپەڕان بخوڤە دگریت.

٢- بەحسەکێ سەربخۆیە، ئانکو نەلێکدانەکا بیرو هزرەکا کورت و ئالۆزە ونە کورتکرییا بەحسەکێ درێژە.

٣- گۆتارێ ئاڤاهیێ خۆیێ تایبەتی هەیە، ژ پێشەکیێ و چەند پەرەگراف و ئەنجاما پێك دهێت، هزرا گشتی یا گۆتارێ: ل دویڤ گرنگیێ، بسەر پەرەگراڤان دابەش دبیت.

٤-پەیف و ڕستەیێن گۆتارێ دڕوون و پوخت و هەلبژارتینە، هەر ئێك وەكی خشتێ دیواری ل جهێ خۆ هاتینە.

٥-ئامانجا وێ یا سەرەكی لڤاندنا هەست و سۆزا خواندەڤانییە.

٦-گۆتارێ ناڤ و نیشانێ خۆ هەیە و دڤێت ناڤ و نیشان دگەل ناڤەڕۆكا وێ بگونجیت.

## نموونەكا گۆتارێ:

گۆتارەك ژ هژمارا (٩) یا ڕۆژنامەیا (كوردستان) بناڤێ (وڵات. وطن) هاتیە بەلاڤەكرن، نێزیكی سێ ستوینا بخۆڤەگرتیە. ل دەسپێكێ دبێژیت:

(وەتەن، ئانكو ولاتی مرۆ، جسمەك وەیە كویێن ژ وی جسمی موتە ئەسیر دبن خەلقێن وێ دەرێنە. دە وێجا هنگی مرۆیین وڵاتەكی خوێ قووەت ببن هەوڤاس ئاخ و بەرێ وی ولاتی خوێ دبە. هنگی بابێ من ژ كوردستانێ ڕابی ومەئمورێن حكوومەت ڕێ دكە سەر گوندو باژاڕێن كوردستانێ وەك مارا، خونا خەلقێن كوردستانێ ڤەدخۆن . . .)

(هەمی بۆ ژبەركرنێیە)

## رامانا پەیڤان:

مرۆ : مرۆڤ

یێن : ئەوێن

وێ دەرێ : وی جهی

خوێ : خودان

هەوقاس : ئەو چەند، هندە

بەر : بەرهەم

ڕابی : ڕابوو ، هەستا

ڕێ دکە : دهنێریتە

ئەڤ گۆتارە ب کوردییەکا ڕەوان هاتیە نڤیسین، ئەگەر هندەك جاران پەیڤێن بیانی ژی بکارهاتبن، بەلێ دارشتناوێ یا ڕوون و رەوانە، ئەڤ گۆتارە هاندانە بۆ هندێ هەڤ وەلاتییێن کورد ئێك و دوو بگرن و دژی داگیرکەران شەڕی بکەن. ڤێجا ئەو داگیرکەر چ عوسمانلی بن وچ مسقوف ئانکو (ڕووس) بن.

## کورتە چیرۆك:

چیرۆك دئەدەبی جیهانێدا ڕەهێن وێ گەلەك دکەڤنن و ژقالبێ هەڤییا فۆلکلۆری و ئەفسانە و داستان و چیرۆکێن گیانداران دەردکەڤیت، بەلێ کورتە چیرۆك وەکی جۆرە ئەدەبەکێ سەربەخۆیە دسەدەیێ نۆزدێدا ل سەر دەستێ (ئەگار ئالان پووگی دی مۆپاسان وچیخەف) قالبێ هونەریا خو وەرگرتیە.

## کورتە چیرۆك ب گشتی دوو جۆرە:

- چیرۆکا بنیاتگەری (ترکیبی).
- چیرۆکا شیکاری (تحلیلی).

هەر ئێك ژڤان دوو جۆرەیان سیما و بنەمایێ خۆیێ تایبەتی هەیە، بەلێ ب شیوەکێ گشتی کورتە چیرۆك ژڤان ڕەگەزان پێك دهێت: (کەس، دەم، رویدان، جە) هەر ئێك ژڤان ڕەگەزان مەرج و خاسیەتێن خۆ یێن تایبەتی هەیە بۆ هندێ دا چیرۆك یا سەرکەفتی بیت.

دئەدەبێ کوردی ژیدا، وەکو ئەدەبێ نەتەوەیێن دی، رەگەزێ کورتە چیرۆکێ بۆ چیرۆکا میللی وئەفسانە و داستانێ . . . دچیت، بەلێ وەکی جۆرەکێ ئەدەبێ سەربەخۆ ل سەدەیێ بیستێ سەرهلدایە و گەشەو وەرارکر.

ئەگەر هزرو بیرێن جودا جودا هەبن، ئانکو ئێکەم کورتە چیرۆکا کوردی کیژکە وکەنگی بەلاڤەبوویە، بەلێ بارا پتر ئەدیبان لسەر وێ چەندێ

رێکەفتینە کو ئێکەم چیرۆك ئەوە یا (فوئادێ تەمۆیە) کو هژمارا (١-٣ ) یا گۆڤارا رۆژی کورد (١٩١٣)ێ ل ژێر ناڤێ (چیرۆك)ێ هاتیە بەلاڤەکرن.

## ئەڤەژی نموونەکە ژڤێ چیرۆکێ:

( شەویش کوڕێ شڤانەکی یە، ب خوە دەە سالییە، زارۆکە، بەلێ پڕ چاڤێ وی گرییە، شەویس دیا خوە نەدییە، ڕەبەن و بەلەنگازە، قەت تشتەکی وان تونینە. تنێ مەتەکی شەویش هەبوو، ئەو ژی پیرەك بوو، شەویش جارنا بال وێ دچە، دلێ مەتا خوە هنك دکر . . .)

(هەمی بۆ ژبەرکرنێیە)

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

دی : دایك

دیاخوە : دایکا خۆە

نەدییە : نەدیتییە

ڕەبەن : بێکەس و کار

بەلەنگاز : هەژار

تونینیە : هیچ نینە

مەت : خويشكا بابێ

جارنا : جارو بار ، هندەك جاران

بال وێ : لایێ وێ

هنك : ڤێنك ، خۆش

ئەڤ چیرۆكە وێنە و دیمەنێ ژیانا تاریاتیا شڤانەكێ كورد بەرچاڤ دكەت، كو ژ بابەكێ پیرو و زارۆكەكێ دەه سالێ پێك هاتیە ناڤێ وێ (شەویش)ە. ڕۆژەكێ ژ ڕۆژان بابێ پیرنەخۆش دبیت، نەشێت، بچیتە بەر پەزی، ریە سپیەكێ گوندی ب نەخوشییا وی دحەسیێت، دهێت (شەویش)ی دبەتە مالا خو، خوارنێ ددەتێ وهندەك خوارنێژی بو بابێ وی دهنێریت و رزقۆییێ كوڕێ خۆ ل شوینا بابێ شەویش فرێدكەت دابچیتە بەر پەزی هەتا بابێ وی ژ نەخوشیا خو باش دبیتەڤە.

ئەڤ چیرۆكە ب دوو خەلەكا هاتیە بەلاڤەكرن ول دوماهیێ نڤیسیە (داوی هەیە -ماویەتی).

دژمارا سێیێدا چیرۆكەكا دی بناڤێ (كندو) هاتیە بەلاڤەكرن، لێ ئەڤە زێدەتر چیرۆكەكا میللییە و دناڤ خەلكیدا یا بەربەلاڤە، گەلەك ب چیرۆكەكا مەحموودێ بایەزیدی ڤە دچیت. دویرنینە هەر ئەو بیت هاتبیتە دارێژتن.

پشتی ڤی چیرۆکا (لەخەوما) یا (جەمیل سائیب)ی دهێت، کو ل سالا (۱۹۲۵)ێ ب زنجیرە درۆژنامەیا (ژیانەوە)دا بەلاڤەکرییە، ئەڤ چیرۆکە هەمی رەخنەیە ل فەرمانداریا شێخ مەحموودی.

## ۳- شانۆگەری:

شانۆگەری بەرهەمەکێ درامییە (کریارییینە) بۆ هندێ هاتیە نڤیسین کو لسەر شانۆیێ بهێتە پێشکەشکرن، ئەکتەر ل دوور کەسانێن شانۆگەریێ دگێرن.

کەفنترین شانۆگەری ژلایێ یونانیان بوویە کو دهەلکەفتێن ئاینیدا دهاتنە پێشکێشکرن، شانۆگەریا هینگی یا ب شیعر بوو، دشانۆیا ڤەکری یا نیمچە بازنیدا دهاتە نیشادان. پشتی یونانیان ڕۆمانیا گرنگی پێ دایە و دچاخێن ناڤەڕاست ژی دا زمانێ لاتینی بسەر نڤیسینێدا یێ زال بوو. شانۆگەری ئێخستبوو ل ژێر خزمەتا بیرو باوەرێن ئایینی. دسەدەیێ شازدێ و هەڤدێدا ل ئنگلتەرا شەکسپیر و هەر ل سەدەیێ هەڤدێدا کوڕتێ و مولیێر وراسین ل فرەنسا گەشەو وەرار ئێخستنە شانۆگەریێ، ل سەدەیێ هەژدێ و نوزدێ پاشی بیستێدا جۆرە رێبازەکا جودا جودا ژ نڤێسین و پێشکێشکرنا درامایێ دناڤ کورداندا سەرهلدا، ژبلی هندێ ڕەگەزێ درامایێ ژ زۆر یاریێن میللی یێن ناڤ کوردەوارێدا هەنە وەکو میر و شڤان، ئاغا و ئاغایانێ و هتد...، ئێکەم دراما کوردی عەبدە ڕەحیمێ رەحیمێ هەکاری ل (۱۸۹۰-۱۹۵۸) بناڤێ مەمێ ئالان نڤیسییە ول هژمارا (۱۵)ێ یا گوڤارا (ژین) ل سالا ۱۹۱۹ هاتیە بەلاڤەکرن.

## نموونه‌یه‌ك ژ شانۆگه‌ریێ

( مه‌مۆ: به‌لێ. . . ئیرۆكه میر عه‌مر كرییه غه‌زایه، نه‌یاران سه‌رحه‌د گرتنه، زاریێ كوردان مه‌عازه‌للاه دێ دبه‌ر ده‌ست وپێیێن دژمنان بچت . . . ئه‌ز ژی كێمترم! ما ئه‌ز كورمانج نیم! ما ناموسا هه‌ر كورده‌كی ناموسا من نینه! ئه‌لبه‌ت ئه‌زێ بچم قیامه‌ت ڕابت دیسا ئه‌ز دچم، خوین سه‌ران ببت دیسا ئه‌ز خوه ناگرم. هه‌تتا خه‌زال ژی من مانع بكه‌ت دیسا ئه‌ز ناوه‌ستم. ئه‌ز مه‌مێ ئالانم. میرێ هه‌كارییان ئه‌مر كرییه . . .)

(هه‌می بۆ ژبه‌ركرنێیه)

### رامانا په‌یڤان:

ئیرۆكه : ئه‌ڤرۆكه ، ئه‌ڤرۆ

عه‌مر : ئه‌مر ، فه‌رمان

غه‌زا : چوونا شه‌ڕێ كافران

سه‌رحه‌د : سه‌ر تخویب ، سه‌ر سنوور

زاری : زاڕۆك ، مندالٚ

مه‌عازه‌للاهـ : هه‌وارا خۆ گه‌هاندنه خودێ، په‌نابرن بۆ خودێ

ئه‌لبه‌ت : گومان تێدانینه هه‌لبه‌ت

خوه‌ناگرم : ئه‌ز خۆ پاش نائێخم

مانیع بكه‌ت : ڕێكێ لێ بگریت ، ڕێگربیت.

هەرچەندە پەهلەوانێ ڤێ چیرۆکێ ناڤێ وی ( مەمێ ئالان)ە، بەلێ هیچ پەیوەندی ب داستانا مەمێ ئالانێ ناڤ کوردەواریڤەنینەو وەکو هەر ناڤەکێ دی بۆ پەهلەوانیا شانۆگەرییێ هاتیە دانان. شانۆگەریێ هزرا نەتەوەیی وئایینی پێکڤە گرێدایە و هەلویستەکێ پڕ سۆز ل دوماهیێ دیارکرییە کو ژ ئەدەبێ بێ مفایێ، کامۆیێ فرەنسی نزیك دبیت.

مەمێ ئالان گەنجەکە ژنوی ژن ئینایە (خەزال) وپیرە دایەك هەیە. کو فەرمانا شەڕی قەڕالێ کافران ددەت و سەلاحەدینێ ئەیوبی روی ب روی خاچ پەرستان دبیتەڤە، مەمێ ئالان ل دویف وێ فەرمانێ دچیت وپشتی سالەکێ دزڤرێتە ڤە ودگەل خەزالا خێزانا خو دچنە سەرو ستوییێن هەڤ دوو و درازێن و خەو دلێ وان دگریت، ل وی دەمی دایکاوی ل مال نەبوو، دەمێ دڤەگەریێتەڤە دایکاوی بسەر هەلدبیت ودبینیت زەلامەك ل تەنشت خەزالا بویکا وێ رازایە، ئەوژی یەکسەر ڕمەکێ لێ ددەت ودکوژیت و خەزال هشیاردبیت وهەوار دکەت (تە چاڤێ خوە کۆرەکر) . . .

ئەڤ دوماهییا دلتەزین دچیرۆکا (مەمۆ) یا فولکلۆریدا هەیە و شانۆگەریا (تێك نەگەهشتن) یا کامۆیێ فرنسی لسەر هەمان بنەما هاتیە.

# کوردییا پەتی

## (١)

زمانێ کوردی، هەر ژدەسپێکا نڤیسینێ، کەفتبوو ژێرکاریگەریا زمانێن هەڤسۆیێن خۆ ب تایبەتی زمانێ عەرەبی، ب هزاران پەیڤ و دەستەواژەیێن عەرەبی دکوردیدا بکاردهاتن، وەلێ هاتبوو گەلەك جاران تنێ دارشتنا رێزمانا رستەیێ ب کوردی دماڤە، لێ هەمی پەیڤێن وی عەرەبی بوون . . . .

ئەگەر ئەم بلەز بەرێ خو بدەینە

نڤیسینێن رۆژنامەیا (کوردستان) و (ڕۆژی کورد) و (ڕۆژا کوردستان) و . . .

ئەڤ راستیە دێ بۆ مە دەرکەڤیت.

میجەرسۆن، کو پشتی هاتنا هێزێن ئینگلیزی بۆ عێراقی و کوردستانێ، خودان دەستهەلاتیەکا زۆر بوو، ل دەسپێکێ ل بەغدا رۆژنامەیا (تێگەیشتنی ڕاستی) دەرئێخست وپاشی ل سلێمانیێ رۆژنامەیا (پێشکەوتن) دەرئێخست. ل سالا (١٩٢٠ - ١٩٢٢ ) سۆن ژبلی هندێ کو وی کوردییەکا باش دزانی، گەلەك بەرهەم راستەوخۆ ژ ئینگلیزی کرینە کوردی و درۆژنامەیا پێشکەوتندا بەلاڤەکرینە، بزاڤ دکر زمانێ کوردی ژ پەیڤێن بیانی پاقژ بکەت. بۆ ڤێ مەرەمێ نڤیسەر هان ددان ب کوردیەکا پەتی بنڤیسن وبەریکانەك ئەنجام ددا وسێ کەسان خەلات برن: یێ ئێکێ شێخ نوری شێخ سالح ب شیعرا (جووت وگاشتێکی چاکە)، یا دووێ: زەکی سائیب ب پەخشانا (بۆ چرووك)، یا سێیێ: جەمیل سائیب ب پەخشانا (ڕۆژەوە بوونێك)، هەرسێك دهژمارەیا (٣٠) یا رۆژنامەیا پێشکەوتندا هاتینە بەلاڤەکرن.

ئەڤەژی نموونەکە ژ (بۆ چرووک) یا زەکی سائیب:

(هەچ وەختێ ئەم قامیشە دوولەتە، ئەم ئاسنە دوو کەرتە ئەگرم بەدەستەوە، زمانم توێ توێ ئەبێ. خوینێ دڵ، ئەو دڵۆپە سوورانە لە هەموو شارەگی لەشمەوە کۆ ئەبێتەوە وئەتکێ حەوزێکی سوور دەخاتە بەرچاوم، تنۆك تنۆك لە چاومەوە فرمێسك ئەڕژی و لەبەر پێما بیرێك پەیدا ئەبێ سەرم وەکو مزراحێکی دگ دگە بەگۆڕ دایکوتی، گێژو سووڕ ئەخواو لەبنیا ئەمێنێتەوە. ئەو هەنسکانەی لە بنکی دڵەوە هەڵئەکشێ لە گەرووما کۆ دەبێتەوە، هەناسەم لێ دەبڕێ، دەمەوێ نەختێ لەم کاسە لێو ڕێژەی دڵم بڕێژم و سووك کەم . . . )

(بۆ خواندنێیە)

دیارە ئەڤ گۆتارە ب کوردییەکا پەتی هاتیە نڤیسین، پەیڤێن بیانی زۆر کێم تێدانە، رستەیێن وێ درێك و رەوانن، داڕشتنا وێ یا پوختەو بێ گرێیە. ناڤەڕۆکا وێ ژی بابەتەکێ خۆییە. . . نڤیسەر بەحسێ بارێ دەروونی یێ خۆ دکەت و دڤێت خەمێن دلێ خۆیێ سووتی ب گەرویا دودکێ دەرببڕیت.

حسين حوزنى موكريانى، كو زمانزان و ديرۆكنڤيسى و هونەرمەندەكێ مەزنێ كورد بوويە، ل سالا ١٩١٥ ل حەلەبێ چاپخانەيەك كڕى وسالا ١٩٢٦ ئينايە ڕەواندزێ، دەست ب بەلاڤەكرنا پەرتووكێن كورد كرو ڕۆژنامەيا (زارێ كرمانجى) ژى دەرئێخست كو دماوەيێ ٩٢٦ - ١٣٢ ، (٢٤) هژمار لێ دەرچوون، دهژمارا (٥)ێ يا سالا دووێدا (١٩٢٨) گۆتارەك بەلاڤەكر بناڤێ (دەورى ئيستيعباد) (ل ٨ - ١٥)، بەحسێ زۆلم و زۆريا كوشتارا (محمەدێ قاجار) دكەت يا دژى گەلێ كورد و زيرەكييا كوردان نيشاددەت ژ بەرەڤانيكرنێ و دەست درێژييێت محەمەد ئاغاى . . . ئەڤەژى نموونەكە ژوێ نڤيسينێ:

(لە كوردەكانى تالْش، سێ كەس دەستيان هاوێژتە خەنجەرى پياوەتى، لە شەوى شەممە، بيست و يەكەمى زيلحيجە، سالّى ١٢١٢دا، نزيك بە سپييدە، لەناو چادردا چوونە سەر ئاغا محەممەد بە خەنجەران پارچەيان كردو سندوقى پڕ گەهەرو بازوو بەندو شيرى گەوهەر بەنو دەرياى نوورو تاجى ماه وگەلێك چتى بەنرخ، كە ئاغا محەممەد لە حكوومەتى كوردەكانى زەندى دەست كەوتبوو، هەموويان هەڵگرت و چوونە كن سادق خانى شقاق، ئەو سێ كوردانە تۆڵەى كوردەكانى تالْش و زەنديان لە ئاغا محەممەد كردەوە. . .).

(هەمى بۆ ژبەركرنێيە)

# سەیید یاقوبێ ماهیدەشتی

سەیید یاقوبێ ماهیدەشتی یێ بەرنیاس ب (سەی یاقۆ) ئێکە ژ هۆزانڤانێن کورد کو هۆزان ب شێوەزارێ لوڕی ڤەهاندییە، زێدەبارێ ڤی شێوەزاری هۆزان ب موکری وهەورامی ژی دانایە، هەر چەندە سالا ژدایك بوون ومرنا وی ب تەمامی روون وئاشکرانینە، لێ بەهرا پتر ژ ێدەرێن ئەدەبی بۆ هندێ دچن کو ناڤبری ل سالا (١٢٢٩)ێ مشەختی کو دبیتە رێکەفتی سالا (١٨١٢ - ١٨١٣) زاینی ل گوندێ (قەمەشە)یێ ماهیدەشتدا ژدایك بوویە، وهەر ژ زارۆکینیێ دانایە بەر خواندنێ، ول دەستپێکێ فێری هەردوو زمانێن فارسی وعەرەبی بوویە، پاشی هەر بۆ خواندنێ قەستا کرماشان کرییە، وهەر بۆ مەبەستا خواندنێ سەرا گەلەك دەڤەران دایە، پاشی بوویە (میرزا) ونڤیسەرلنك حەسەن خانێ فەرمانڕەوایێ کەلهوڕ،لنك وی دمینیت هەتا ل سالا (١٢٩٢) ێ مشەختی کو دبیتە رێکەفتی دگەل سالێن (١٨٧٤ - ١٨٧٥) زاینی وەغەرێ دکەت، وتەرمێ وی ل گوندێ (قەمەشە) دهێتە ڤەشارتن.

دیوانا وی نزیکی (٢٠) هزار هەڵبەست بوویە، لێ یا تێکچووی و چ ژێ نەمایە بتنێ نزیکێ هزار هەڵبەستان ئەو ژی نەگەهشتییە چاپێ.

## ناڤەرۆکا هەلبەستێن وی:

وەك پتریا هۆزانڤانێن کلاسیکیێن رۆژهەلات، سیفەتێن زالٚ ل سەر هەلٚبەستێن سەیید یاقوبی دا ددیارن، و دئەڤان چەند تەوەران دا دیاردبن:

١-تەوەرێ هەلٚبەستێن دلداری و خۆشەویستیێ، کو دیارە کاریگەریا سەعدی شیرازێ فارسی ومەلا خدرێ نالٚیی کورد ب سەر ڤی بوارێ هەلٚبەستێ دا تا رادەیەکێ زۆر دیارە، وئەو دلداریا کو سەیید یاقوبێ ماهیدەشتی بەحس لێ دکەت پتر بەرەڤ گۆشا دلداریا عوسمانی ڤە دچیت ونزیکێ تەسەووف وخواپەرستیێ ڤەیە، پشکا زۆرا هەلٚبەستێن کەڤتینە بەر دەستێ مە و ژ بەرزەبوونێ رزگار بووین هەلٚبەستێن دلدارینە، نموونا وان ژی ئەڤ چەند دێرەنە:

| | |
|---|---|
| (١) گا پەروانەی دەور شەم جەمالانی | گا هامرازی راز کـــەمەر لالانـــی |
| (٢) گەهێ سکووتـی گەهێ نالانی | گـا چـون ئەودالان وێـــلٚی مـــالانـی |
| (٣) من هەر دەواکەم تۆ هەر زامەنی | تۆ تاکەی نەفکر سەودای خامەنی |

٢-تەوەرێ هەلٚبەستێن وەسفا دیمەنێ سرۆشتی، تەوەرەوکێ دی یێ ناڤەرۆکا هەلبەستێن وی کو دیارە جوانیا سرۆشتی و دیمەنێن جوانێن بوهارێ ژێدەرێ ئیلهامێ بوویەلنك وی، ژبەرهندێ دەمێ دهێتە بەحسێ بوهارێ و دیمەنێ سرۆشتی ب شارەزایی بەحسی وان جۆرێن گول وگولزارێن بوهارا کوردستانێ دکەت، ودبێژیت:-

١- ئەر خـــەوان نەرگس و نەسرین و یـــاس ویـــاســەمەن
سۆســـەن و لاولاو ولیلـــو لالـــە هـــایی ئەحمـــەدی

٢- کـــاج وشمشـــادو سنەوبەر عەرعەرو سەرو وســەهی
ســـەر فرازان قەد کـــەشیدە تـــا وە چـەرخ داوەری

٣- فەسڵی عەیش و فەسڵی نۆش و دل بە جۆش وغەم خـەمۆش
بـــادە نۆش و دەس نـــەدۆش و مـــاهڕوویانی پەری

٤- فاسڵی گوڵ، فەسڵی رەیاحین، فەسڵی سونبول، فەسڵی عشق
ئەم بەهـــار لالەزارو ئەم شـــەرابی کـــەوســـەری

(هەمی بۆ ژبەرکرنێیە)

٣- تەوەرەکێ دی یێ هەڵبەستێلنك سەییدیاقوبی، تەوەرێ هەڵبەستا ئایینی یە، دڤی جۆرێ هەڵبەستێ ژی دا هەسپێ خۆ ڕاکرییە چوار گاڤێ، وب شارەزایی مەلەڤانی ددەریایا ڤێ هەڵبەستێدا کرینە.

هەڵبەستێن سەیید یاقوبی بخوینینەڤە، دێ بینین وەکو مرۆڤەکێ شارەزا دئەدەبێ فۆلکلۆریێ نەتەوێ خۆدا گەلەك جاران پەنابریە بەر بکارئینان ومفاوەرگرتنێ ژ پەندێن پێشینان، ژبو هندێ دا هەلبەستێن خۆ پێ ب

خەملینیت و جۆرەکێ موکمیەکێ بدەتە ناڤەرۆکا هەڵبەستێن خۆ. بکارئینا پەندێن پێشینان نیشانا پلە و پایا شارەزاییێ یە دئەدەبێ فولکلورێ کوردیدا.

بۆ نموونە دبێژیت:-

رای رووا و ئەنجیر کـەردەنی وەپیش

باوە توو گورگی های نە چەڵدەمیش

(بۆ ژبەرکرنێیە)

ئاماژەیە ب گوتنەکا مەزنان کو ب شێوەزارێ لوڕی ب ڤی رەنگی یە:

((ڕووا دەمی وە دار ئەنجیر نارەس، ئوشێت خراوە)).

ڕامانا دێرێ: تە ڕێکا ریڤی وهژیرێ یا گرتی یە بەرخۆ، بابۆ تۆ گورگی لێ دپیستێ میهێ دا ی.)).

## رۆخسارا هەڵبەستێن وی:

بەری نهۆ مەگوت کو سەیید یاقوب وەکو هەر هۆنەرەکێ وی سەردەمی دا، دهەڵبەستێن خۆدا بیێ کو پێ بزانیت رێکا رێبازا کلاسیکیان یا گرتییە بەرخۆ، ب تایبەت ئەو رێبازێن هەڵبەستێ یێن کو دگەل رێبازا کلاسیکیا رۆژهەلاتدا دگونجیت، چونکی:

١- دهەلبەستێن خۆدا زمانەکێ کوردی تێکەل ب پەیڤێن عەرەبی وفارسی بکارئینایە،کودیارەلدویڤ بۆچووناوان ئەڤکارەجۆرەخەملاندنوزیرەکی

وجوانیێ ددەتە رۆخساری وسیمایێ هەڵبەستێ.

٢- پشکا زۆر ژ هەڵبەستێن وی ل سەروان کێشێن (عەرووز)ێ هاتینە دانان کو هوزانڤانێن عەرەب وفارس ژی ل سەر وان کێشان هەلبەست ڤەهاندینە، رەنگە ئەڤەژی ژهندێ بیت کو سەیید یاقوب ل بن کاریگەریا هەلبەستێن مەلا خدرێ نالی دا بوو (١٨٠٠ -١٨٧٣)ز، کو سەیدایێ وی بوو.

٣- چونکی یێ کەڤتییە بن کارتێکرنا هەلبەستێن هەورامی، دێ بینین ژمارەیەك ژ هەلبەستێن وی ب کێشا (پەنجە - بڕگە) هاتینە دانان، ژبلی ئەڤێ چەندێ ژی ژلایی بکارئینانا پەیڤان ژی ڤە ب سەر هۆزانڤانێن گۆران (هەورامی) ڤەدچیت. وەکی دبێژیت:

زاهــد حــەرامەن، زاهد حــەرامەن
زاهــد زیندەگی وەتــوو حــەرامەن
نەشــوورت وەســەر نەپــات وەدامــەن
نە هەرگیز مەجلس عەیشت مەقامەن
تەماشــی ئەبرۆی خــەم نەکردنی
ژەو خــەم و قــامەت چەم نەکردنی

(بۆ ژبەرکرنێیە)

٤- ب گشتی ئەگەر سەحکەینە رۆخسارێ هەلبەستێن سەیید یاقۆبی وب هویری لێ ڤەکۆلین، پتریا وان هەڵبەستان دناسکن ودژێگرتینە، ب

زمانەکێ سادە وبێ گرێ ڤەهاندینە، وئەڤە ئێکە ژ سیماییێن دیارێن هەڵبەستا هۆزانڤانێ ناڤبری. دیارە سەیید یاقوب ژی وەکو هەر هۆزانڤانەکێ کوردێ وی سەردەمی کەڤتییە بن کارتێکرنا چەند هۆکارەکان کو دەلیڤە بۆ پەیدا کرییە و رێ بۆ خۆش کرییە داکو رێکا هەلبەست ڤەهاندنێ بگریت وببیتە هۆزانڤان، هندەك ژڤان هۆکاران هاوبەشن وکارتێکرنا وان ل سەر هەمی هۆزانڤانان هەبووینە، هندەکێن دی ژی دتایبەتن ب وی ب خۆڤە، ژبەر هندێ ب شێوەیەکێ گشتی دشیێن ئەوان هۆکاران دئەڤان خاڵێن خوارێدا کۆم بکەین:

١- خواندنا شاکارێن هۆزانڤانێ ب ناڤ و دەنگێ فارسی زمان (سەعدی شیرازی، ئەو شاکار ژی (گولستان) و (بووستان) بوون.

٢- کارتێکرنا هندەك هۆزانڤانێن کورد، وەك (ئەلماس خانی کەلهوڕ) و (خانای قوبادی) و (نالی) و (سالم)، ب تایبەت گەلەك شەیدایێ هەڵبەستێن (نالی) بوویە، وژبەر هندێ هژمارەکا زۆر ژهەڵبەستێن وی ژ هۆزانڤانێن کەلهوڕ وموکری وەرگرتینە. (نموونە بپ ٥).

٣-وەکو پتریا هۆزانڤانێن بەری خۆ و سەردەمێ خۆ ژی، گرێدای وئێخسیرێ داڤێن عەشقێ بوویە وئەڤی هۆکاری کانیا هەڵبەستێن وی هەلکۆلایە وئاڤێ خۆ هەلاڤێتییە.

ئەڤەژی نموونەکە ژوان هەڵبەستێن وی کو ل بن کارتێکرنا ناڵی دا نڤیسییە:-

١- شـــووریّ وه ســـــەرم کەوتییە لـــــەم مەستی چـــــاوە
هیچ جێگە نەنیشم مەگــــــەر ئەوجی کە شـــــەراوە

٢- ئەم زولف روخی دولبـــــەرە؟ یـــــا لەیل و نەهـــــارە؟
یـــــا هـــەوری ڕەش و پەردەکەشی بـــــانی هەتـــاوە

٣- ڕووخساری توو وەک مانگ و دوو زولفت وەکو عەقرەو
هەر چـــــەن کە قەمـــــەر عەقرەوە، ڕازیم بە قەزاوە

٤- ســـــۆزی دڵمە بـــــاعسی تـــــاوو کـــــوڵی گریـــــان
مەعلوومە کە ئـــــاگر ســـەبەبی جۆشــی ئـــــاوە

(هەمی بۆ ژبەرکرنێیە)

## ڕامانا پەیڤان:

١-شۆریّ وەسەرم کەوتییە : نەخۆشییەك کەڤتییە سەریّ من.

هیچ جێگە نەنیشم : چ جە نینن تێدا دانیشم.

واتە : نەخۆشیەکا وەسان کەڤتییە سەریّ من ژبەر مەستا ئەڤان چاڤان، چ جهـ نینن کو تێدا برینمە خواریّ، بتنێ ئەوجهـ نەبیت کو وێنێ چاڤێ دۆستامن تێدا هاتییە کێشان، وئەو تێدا هەبیت.

٢-روخ : ڕوی، دەم و چاڤ

پەردەگەشی : پەردە کێشایە.

بانی : ل سەر.

واتە : ئەڤە زولف و ڕوییێ خۆشەویستا منە؟ یان ئەڤە شەڤ و رۆژە. لڤێرێ دا زولف وەکو رەشاتیا شەڤێ و روی وەکو گەشاتیا رۆژێ وەك ئێك لێکرینە، یان ئەڤە عەورێ تاری و رەش وەکو پەردێ خۆ ب سەر هەتاڤێ دادایە، ولڤێرێ زولف ب عەورێ ڕەش و ڕوی ب هەتاڤی وەك ئێك لێکرینە.

٣-ڕووخساری توو : روییێ تە.

عەقرەو : دوپشك.

واتە : روییێ تە دجوانییێ دا وەکو هەیڤێ یە، وهەردوو زولفێن تەژی وەکو دوپشکی دوەربادابنە، هەر چەندە کو هەیڤ ب دەستێ دوپشکی لاوازبوویە، لێ ئەڤ قەدەر وقەزایە بۆ وان هاتییە.

٤-سۆز : شۆڕش ، سۆتن.

باعسی : هۆکار و ئەگەرێ وی.

تاووکوڵ : ب لەز وبۆشی.

جۆ ششی : فویریان.

واتە : شۆڕش و سۆتنا دلێ من بوویە ئەگەرێ هندێ کو بارانا روندکێن گریانا من ب گەرمی برژن، ئەڤە تشتەکێ راستە کو ئاگر ئەگەرێ فویریانا ئاڤێ یە، ئەگەر ئاگرێ عەشقا تە نەبیت، روندکێن من ب ڤی رەنگی نارژنە خوارێ.

# عەلی حەریری

عەلی حەریری ئێکە ژ هۆزانڤانێن کلاسیزمی یێن کورد ناڤێ وی (عەلی) یە ب ناڤێ گوندێ وی (حەریر) جهێ ژ دایك بوونێ ب ناڤ کرییە.
(حەریری) گوندەکە ل ناحیا (شەمزدینایە) کو دکەڤیتە دەڤەرا (هەکاری) یا.

ناڤ و دەنگێن دەست هەلی و هۆستایی و ئێخستنە بەرێك و سەنگاندنێ ب ئاوازەکێ خۆش ودلڤەکەر دکوردستانێدا ناڤدار بوویە.
عەلی حەریری خوێندکارێ جهێ هەکاریان بوویە. زاناو رۆشنبیر بوویە، مێژوو نڤیسێ کورد (شەرەفخانێ بەدلیسی) د (شەرەفنامێ)دا خوێندکارێن هەکاری ب سەر خوێندکارێن کورد ئێخستینە. پەسنا زیرەکی و جوامێرییا وان کرییە.

هەروەسا شاعیرێ کوردێ ب ناڤ ودەنگ (حاجی قادرێ کۆیی) مەزنی و شاعیرییا عەلی حەریری دەردئێخیت، چونکە ل پاڵ وان شاعیراندا یێ کو باسێ وان دکەت ناڤێ عەلی حەریری ب ڤی جۆری دهینیت دەمی دبێژیت:

ئەوی جامی گوتوویەتی ئەمەیە
لەو قسەو مەدحە مەقسەد ئەمەیە
پیرە مەردێ بدیدە ئەم ز جەزیر
نیک مەردێ بدیدە ئەم ز حەریر

حاجی دبێژیت مەبەستا (جامی) ژوێ دێرێ (عەلی حەریری)یە دەمێ دبێژیت: من پیرەمێرەك دیت خەلکێ جزیرێیە وپیاوەکێ چاك دیت خەلکێ حەریرێیە.

دگەلەك ژێدەرێن ئەدەبیاتێ کوردیدا وەسا لێك دەدەن کو مەبەست پێ (مەلا جزیری) و (عەلی حەریری)یە.

ژدایك بوون ومرنا عەلی حەریری تا ئێستا ڕوهن و ئاشکرا نەبوویە هەر سەرچاوەیەك ب هۆزانڤانێ سەدەیەکی دادنیت.

لێ یا دیارو ئاشکرا، عەلی حەریری پێش ئەحمەدێ خانی یێ ژیای چونکە خانی دکتێبا (مەم وزین)ێدا ناڤێ حەریری ب یێ (مری) دئینیت دەمێ دبێژیت:

من دی عەلەما کەلامێ مەوزوون

عـــالی بکرا ل بانێ گەردوون

بینـــاڤە ڕوحـــا مـەلی جزیری

پێ حەی بکـــرا عەلی حەریری

کەیفەک وەبدا فەقێ تەیـران

حـــەتا ب ئەبەد بمایە حـــەیران

واتە: ((ئەزدا ئالاێ هۆزانێ و تۆرێ کوردی ل هەرچوار ڕەخێن جیهانێ بەرزکەم. گیانێ مەلای جزیری زیندوو کەمەڤە، دا عەلی حەریری ب گیان ئێخم. ب زیندووکرنا جزیری و ب جان ئێخستنا حەریری ب ڕادەکێ وەسا فەقێ تەیران دلگەش و بەختیارکەم تاکو هەتا هەتایێ ئەو دلگەش و شادمان مابا)).

چەرخێ ژیانا عەلی حەریری ب دروستی ڕوهن و ئاشکرانەبوویە، دتارییا نەزانینێ دایە. تنێ ئەو تشتێ نهۆ ددەستدا دێڕە شیعرا (پێ هەی بکرا عەلی حەریری) یا خانییەو یاکو ناڤێ وی پشتی جزیری ئینایە.

جزیری ل سالا ٩٥٧ کۆچی ژ دایك بوویە و ل سالا ١٠٥٠ کۆچی پێ مری.

حەریری د وارگەهەکێ کوردیدا نزیکی نیڤا دووێ ژ سەدێ شازدێ و سەدێ سەدێ هەڤدێ زایینی ژیایە. لێ هندەك دبێژن خەلکێ (حەریرە - دێر حەریرا) ل دەڤ هەڤلێرێیە، ئەگەر خەلکێ (دێر حەریرا) بیت ئەڤە بەلگەیەکێ تازە بۆ مێژوویا ئەدەبی کوردی ددەتە دەست و ئەو ژی ئەوە کو ئەدەبیاتی کرمانجییا ژووری د وی سەردمیدا ب ڕەنگەکێ وەسا د (بۆتان) دا گەشە کرییە تا گەهشتییە دەڤەرا سۆران و ئەگەر میرگەها بۆتان تێك نەچووبا ئەڤ دیالێکتە وەسا دا بەلاڤ بیت کو هەمی کوردا پێ نڤیسیبا.

ئەو وارگەهـ و جڤاکێ عەلی حەریری تێدا ژیای وەکی هەمی جڤاکێن دی یێن کوردی ژلایێ ئابووری و ئاڤەدانکرنێ د پاشکەفتی بووینە و دبن کارتێکرنا ئۆلێ (ئاینێ) موسڵمانەتیێ ڤە بووینە. ژبەر هندێ ڕێ و دەرگەه هەمی بۆ سۆفیاتیێ د ڤەکری بوون و ڕەهێن خۆ تێدا ببەنە خوارێ، هێلینێن خۆ د مەژیێ زاناو نە زانادا چێکەت. ژبەر هندێ هۆزانێن عەلی حەریری یێن کو ژ دیوانا وی ماین و دبەردەستن، ڕوییێ وێ جڤاك و وارگەها کوردی بەرچاڤ دکەت کو حەریری تێدا ژیایە.

عەلی حەریری هوزان ب دیالێکتا کرمانجییا ژووری ڤەهاندینە، هەتا نوکە ژبلی چەند پارچە هۆزانێن، حەریری زێدەتر ب دەست نەکەفتینە.

عەلی حەریری هۆزانڤانەکە سەر ب قوتابخانا مەلای جزیری بوویە، پەیوەندی ب ناڤەڕۆك و ڕووخسارێ وی جۆرێ ئەدەبا کلاسیزمی ڤە هەبوویە.

## ژ هۆزانێن عەلی حریری

١- دیسـان زنۆ عەشقـا بەری، پڕ ئـەندەروونم ئا تەشە
زولفـا موزەییەن عەنبەرێ، دەعوا دگـەل خـالا ڕەشە

٢- خـالا ل دێمی دل ڕەڤا، سـەد ڕوح و جـانم بـن فیـدا
سووتم گەلۆ چوم تێ نەما، تەرکم کردن عەقل و هوشـە

٣- عەقل و هۆشم بوونە ئەسیر، دنیا کـو گەهگەه تێتە بیر
دێم شـوبهەتا بەدرا مونیر، زولفـا ژ وەردێ بێن خوشـە

٤- وەردان ژ نێڤ زولفـا دەرین، شـوعلا بەنەفشی تێ وەرین
بـالا و قـەددا عەرعەین، هەرێـان ل سەر مارێ ڕەشە

٥- دیسـانێ حەی تێت و دچێت، ئیحیـایی ئەمواتـان نەبیت
وەجهان مودام نوور ژێ تەچێت، دێم شوبهەتی شەمعا گەشە

٦- شەمعـا شەبستـانان ئـەوە، وەردا گولستـانان ئـەوە
سڕی تەبستـانان ئەوە، شۆخـا (حەریری) دڵ گـەشە

٧- عەجیب لەتیف و جنـــــدییە، ئەزمـــان نـــەزان و (ڕۆمی) یە
ئاگــــەه ژ عەشقبـــازان نییە، مــەست و خومارو سەر خوەشە

٨- ســــەرخۆشێ جاما شــەربەتێ، دێم شوبهی شــــەمعا زولمـــەتێ
حوریا دبـــاغێ جەننـــــەتێ، ســــەرداریێ چەندین مـەهوەشە

٩- مەهوەش کـــو وەستان سەف ب سەف، ئەو هاتەدەر میری دکەف
وان گۆت (عەلی)یۆ لاتـــەخەف، مــــە ب مردنێ قـــەوی خوەشە

(پێنج دێرین دەسپێکێ بۆ ژبەرکرنێنە)

## ڕامانا پەیڤان:

ژنۆ : سەر ژنوی.

ئەندەروون : ناڤ دەروون.

ئاتەش : ئاگر.

موزەییەن : خەملاندی.

دەعوا : شەڕ، جەنگ.

دێم : سەرو چاڤ.

دڵ ڕەڤا : دل ڕەڤاند

چو : چ ، هیچ.

بێن : بێهن.

ژنیف : دناڤ بەرا.

هەریان : شین بوون.

حەی : مار.

شەبستان : شەڤە زەنگ، تاریستان.

تەبستان : هاڤین.

جندی : جوان.

مەست : سەرخۆشی.

مەهوەش : نازدار، وەکو هەیڤێ.

دکەف : ددەستی دا.

لاتەخەف : نەترسە.

دەست هەلی : زیرەکی.

چەرخ : سەدە.

نهۆ : ڤێگاڤێ.

مالك : دێرا هۆزانێ.

ئۆل : ئایین.

١- دیسان ژ سەرو ژنوی عەشقا بەرێ سەرهلداڤە وناڤ دەروونێ من پڕی ئاگر کر، ئەو زولفا ب عەنبەرا بهێن خۆشی هاتییە خەملاندن شەڕی دکەت دگەل نیشانا رەشا دێم رویێ یاری.

٢-ئەو نیشانا ل دێمێ یاری دلێ من ڕەڤاند، سەد ڕۆح و گیانێن من گوری وقوربانێ وێ بن، ئەی گەلی خەلکی وێ ئەز سۆتم و چ دمن نەما وعەقل وهۆشێن من نەهێلان.

٣- عەقل و هۆشێن من بوونە ئێخسیر وبەندەیێن وێ نیشانا رەش و جاروباران هزرا دنیایێ دکەم ئەگەرنە من ئاگەهـ ژ خۆ نەمایە، ودێمێ تە وەکی هەیڤا پڕ رووناهی یە و زۆلفا تە ژی وەکو گولا بێهن خۆشە.
٤-گول دناڤ زولفان دا شین دبن، شوعلە وگولێن بنەڤشوك بەسەردا دهێن، بەژن وبال وەك عەرعەرن و مارێ رەش ل سەر دچیت، مارێ رەش مەبەست پێ (زولف)ە.

٥-دیسان ئەو مارێ رەشی دهێت ودچیت، مرییان زیندوو دکەت.
دێم وروی وەك مەیێ بەردەوام رووناهی ژێ دبرسقیت ودێم و روی وەکی شەمالکێ نە.

٦-ئەو دێم و رویێ شەمالك وچرا دشەڤا تاریدا، هەر ئەو گول و گولزاران، ئەوە نهێنیا گەرما دلێ من، شۆخ و شەنگ و جوانی ودلگەشیا حەریری یە.

٧-گەلەکا سەیرو وجوان وقەشەنگە، زمانێ کوردی نزانیت، چونکە ڕۆمییە واتە تورکە، ئاگەهـ ژ عاشقان نینە، چونکە هەمی دەمان یا مەست و سەرخۆشە.

٨- ب جانا (کاسا) شەربەتێ سەرخۆشە، دێم و روی وەك شەمالکێ یە دتاریێ دا. دباخچێ بەهەشتێ دا حۆرییە، سەردار وسەرکێشا مەزنا کۆما جوان و نازدارایە.

٩- نازدار پۆل پۆل راوەستانیە ویێن رێزبووین، ئەو نازدار ژی هات شیرێ مسرێ ددەستێ دا بوو، ئەوان گوت (عەلی) نەترسە، دلێ مە ب مرنێ گەلەك یێ خۆشە.

# مەحوی

## ١٨٣٠ - ١٩٠٤ ز

### ژیانا وی:

هۆزانڤانێ پایە بلند ناڤێ وی (محەمەد)ە، کوڕێ مەلا عوسمانێ بالخییە، ژ نەڤیێن زانا (شێخ رەش)ی یە، ل سالا (١٨٣٠ز) ل سلێمانیێ هاتییە دنیایێ، ل حەفت سالیێ دانایە بەر خواندنێ، ماوەکی ل دەف بابێ خۆ پەرتووکێن بچویك خواندینە، پاشی ب فەقیاتیێ وبۆ خواندنێ چوویە باژێرێ (سنە، سابلاغ)، پاشی ڤەگەڕیایە سلێمانیێ، ل دەف مامۆستاییێن ناڤدارێن وێ دەڤەرێ خواندییە. پاشی چوویە بەغدا ول دەف زانایێ ب ناڤ دەنگێ کورد مفتی زەهاوی خواندییە و ماوەیەکی ل دەف وی مایە هەتا ئیجازا مەلایەتیێ دایێ وکرییە مامۆستایێ مزگەفتا (ئیمام ئەعزەم) ل بەغدا. ل سالا (١٨٦٢ز) ژ بەغدا ڤەگەڕیا سلێمانیێ وبوو ئەندامێ دادگەهێ. ل سالا (١٨٦٨ز) ژئەگەرا مرنا بابێ وی دەست ژ کارێ میری بەردا و بوویە مەلا ودەست ب وانە گوتنێ کر بۆ فەقییان.

ل سالا (١٨٨٣ز) مەحوی چوویە حەجێ، وژ وێرێ چوو ئەستەنبولێ وب رێکا کەسایەتیێن کوردان چاڤ ب سولتان عبدولحەمیدێ عوسمانی کەڤتییە، سولتانی رێزەکا زۆر لێ گرت وفەرمان دا کو مزگەفتەکێ ل سلێمانیێ بۆ ڤەکەن، ب ناڤێ (مزگەفتا مەحوی)یە.دەمێ ڤەگەڕیایە سلێمانیێ مژیلێ وانە گوتنا زانستی و ئاینی بوو وڕابەریا خەلکی کر د بوارێ سۆفیاتیێ دا. ل سالا (١٩٠٤ز) وەغەرکر و ل مزگەفتا وی هاتییە ڤەشارتن.

د جەحێلینیا وی دا کەلا عەشقێ ددلێ وی دا پەیدابوو، وبەرەڤ عەشقەکا موکم ڤە دچوو، وبوویە ئیلهاما هەلبەست گوتنا وی. پاشی پەیڤا (مەحوی) هەلبژارتییە وکرییە نازناڤێ خۆ یێ هەلبەستێ.

ئەو بنەمالا مەحوی تێدا مەزن بووی وهاتییە پەروەردەکرن بوویە ئەگەرا هندێ کو بەرەڤ مۆزە خانەیا ئەهلی یا سۆفێنزمیێ ڤە بچیت و هەڤبەرکرنا بیرو باوەرێن وان دگەل دلێ خۆ بکەت، هەر بیرو باوەرێن مەحوی یێن سۆفیاتیێ ئەو کرە هۆزانڤانەکێ ناڤدارێ سۆفیاتیێ.

مەحوی ب ئێك ژ هۆزانڤانێن بەرزێن کلاسیکیێن کوردی دهێتە دانان. ول سەر رێبازا نالی چوویە.

## رۆخسارێ هەڵبەستێن وی:

١-کێشا عەرۆزا عەرەبی بکارئینایە.

٢-ئێکبوونا سەروایێ پاراستییە، هەڵبەستا وی هەمی ل سەر ئێك سەروا بوو.

٣-پەیڤێن عەرەبی وفارسی دهەڵبەستێن وی دا ددیارن.

٤- وشەکاری و وردەکاری گەلەك بکارئینایە، ولدویف پەیڤێ ودەربڕینا گران گەڕیایە.

## ناڤەرۆکا هەڵبەستێن وی:

ژلایێ ناڤەرۆکێڤە هەڵبەستێن وی دەربارەی ئایینی وفەلسەفە و سۆفیاتیێ وهەستێ نەتەوەیی یە.

### ئەڤەنموونەیەکە ژ هەڵبەستا سۆفیاتیێ یا مەحوی:

١- دیـــــارم دەیری عیشقـــــە، بە ســـووتن بێ لەوێ دەگــــرم
کەمن مشتێ چڵ و چێوم، بەچی بم، کەلکی کێ دەگـرم

٢- نەگـــــەییە دامــــەنی دەستی دوعا، جا دەبمە خـاکی ڕێی
تەریقەی گـــۆشەگــیری بەردەدەم، ئەمجارە ڕێ دەگرم

٣- کـــــەدادی یەئسی خۆمم بردە لا، ئەم عــــارفە تــــوند بوو
وتی: ئـــاخر سبەینێ جـــەژنە، خـــوێنی تۆ لەپێ دەگـرم

٤- لە ڕوو ســــوریی عیبادەت لام و لەڕوو زەردەی خەجــالەت مام
بەنـــاوی سێوی ناوم بـــاغەوان ومـــن بـــەهێ دەگــــرم

٥- لەســـــەر خۆچـــوونە، شەیدابوونە، قوڕ پێوانە، ســــووتانە
هەتـــا مردن، مەحەببەت ئیشــــی زۆرە، ڕیزی لێ دەگـرم

٦- چ شـــۆخه ئاگـــرم تێبەر دەدات وپێـــم دەڵێ یا شێخ
بە خاشـــاکی دەوت شوعلە، عەســـامە دەستی پێ دەگرم

٧- کەسینەی ڕێشمی بەو تیغی نازە ئەنجن ئەنجن کرد
وتـــی: پەژموردەیـــە ئـــەم لالەزارە، ئـــاوی تێدەگرم

٨- لە پاداشتی قســـەی ســـەردا هەمە ئاهو هەناسەی گەرم
کـــەسێ شێتـــانە بـــەردم تێگرێ، من بەرقی تێدەگرم

٩- شوکـــر هوشیـــارە مەحوی، تێدەگـــا دونیا خەراباتە
کـــە بەدمـــەستی بکـــا ئەهلی، خراپەی بۆچی لێدەگرم

(ژدەسپێکێ پێنج دێر بۆ ژبەرکرنێنە)

مەحوی د مەیدانا کوردەواریدا دئەڤان چوارینێن خوارێدا هەستێ نیشتمان پەروەری ونەتەوە پەرستیا خۆ دەربڕییە وشانازی پێ کرییە. دبێژیت:

١- لە دەوری دڵمـــی کـــە دی ئـــەم هەموو غەم و تەعەبە
دەروونـــی کـــەیلە لـــە زووخاو ودەردو تـــا بەلـــەبە
وتـــی: ببێ دڵـــە! وەک تۆ خـــەراب و شیفتـــە حـــاڵ
بـــەلێ هەیـــە لـــە مـــن ئـــاشفتە تـــر: ولاتی بەبە

٢- بنووسە، پیری دڵم ئەمری کرد، ئیتاعەم کرد
لە ئیبتیداوە کە بەینێ موناسبی دیوان
گەدایەکی وەکو مەحوی، قەلەندەرێکی کورد
میسالی پادشەهی فورسە، ساحێبی دیوان

(ئێك ژ ئەڤان دوو چوارینان بۆ ژبەرکرنێیە)

## رامانا پەیڤان:

| | |
|---|---|
| دیار | : ب رامانا جە و ولاتی هاتییە. |
| دەیر | : دێر، جهێ ڕەبەنی یێ کریستیانان. |
| گوشەگیری | : دوورە پەرێزی. |
| عارفە | : ڕۆژا بەری جەژنا قوربان (عەرەفات). |
| لام | : بێ بەش. |
| شۆخ | : زۆرزان. |
| ڕێش | : بریندار. |
| پەژ موردە | : سیس بوو. |
| سەرد | : سارد. |
| خەرابات | : مەیخانە. |
| بەدمەستی | : سەرخۆشی. |

بەناوی سێوی ناوم : ب سێڤێ ناڤێ من برییە، ناڤێ من کرییە سێڤ.

# شێخ ڕەزایێ تالەبانی

## ١٨٣١ز - ١٩١١ز

### ژیانا وی:

ناڤێ وی (ڕەزا)یە، وکوڕێ شێخ ئەحمەدێ کوڕێ مەلا مەحموودێ زەنگەنەیە. ل سالا (١٨٣١ز) ل گوندێ (قرخ) سەر ب باژێرێ کەرکووك ڤە ژدایك بوویە، ل مزگەفتێ خواندییە، ژبلی زمانێ دایکێ زمانێن عەرەبی و فارسی وتورکی باش دزانین، هەلبەست ب ئەڤان هەر چوار زمانان نڤیسینە وتێدا یێ دەست هەل بوو، شارەزایی د ئەدەبیاتێن فارسی و عەرەبی و تورکی هەبوو، ماوەیەکێ ل ئەستەنبوولێ ژیایە، پاشی ڤەگەڕیایە کەرکووکێ و ل سالا (١٨٩٨)ێ چوویە بەغدا، ول وێرێ پەیوەندی دگەل بنەمالا سەلیم بەگێ بابان و سەید عبدولرەحمان نەقیبێ بەغدا هەبوون هەتا ل سالا (١٩١١)ێ ل ژیێ (٧٩) سالێ دا وەغەرکرییە، ول گۆڕستانا مزگەفتا شێخ عبدولقادرێ گەیلانی هاتییە ڤەشارتن. . .

دیوانا وی هەتا نهۆ چەند جاران ل کوردستانێ و ژ دەرڤەی کوردستانێ هاتییە چاپکرن، دیوانا وی یا کرییە سێ پشك (پشکا کوردی و فارسی و تورکی) و دهەرسێ زمانان ژی دا هۆزانڤانەکێ سەرکەفتی بوویە، تا وی رادەی هندەك ژ شارەزایێن ئەدەبێ تورکی ب هۆزانڤانەکێ مەزنێ نەتەوەیا تورك ددانن کو ئەڤە ژی راست نینە. ب ڤێ چەندێ زۆرداریەکا مەزن ل هۆزانڤانێ کوردێ مەزن دکەن.

١-چاپا ئێکێ یا دیوانا ل سالا ١٩٣٥ز ژلایێ مەریوانڤە ل بەغدا بوویە.

٢-(دیوانا شێخ ڕەزایێ تالەبانی) چاپا سالا ١٩٤٦ ل بەغدا ژلایێ شێخ عەلی تالەبانیڤە هاتییە چاپکرن.

٣-(دیوانا شێخ ڕەزا) چاپا سالا ١٩٩٩ ل سلێمانییێ هاتییە ئامادەکرن و لێکدانا (ئومێد کاکە ڕەش و حەمەبۆر)ە.

٤- (دیوانا شێخ ڕەزا) ساخکرنا شوکور مستەفا چاپا (٢٠٠٠)ێ ل باژێرێ هەولێرێ.

٥-(دیوانا شێخ ڕەزا) ساخکرنا ولێکدانا د. موکەڕەم تالەبانی ل سالا (٢٠٠١) ژ باژێرێ هەولێرێ هاتییە چاپکرن.

٦- (شێخ ڕەزایێ تالەبانی) سەرکیشێ هۆزانڤانێن ڕۆژهەلاتا ناڤەڕاستە، ڤەکۆلینەکا تێرو تەسەل لسەر ژیان و هۆزانێن وی ژلایێ نڤیسەر (ئەحمەد تاقانە).

## مەبەستێن شیعرا شێخ ڕەزایێ تالەبانی:

هۆزانییێن شێخ ڕەزایێ تالەبانی ئەڤ مەرەم ومەبەستە تێدا دهێنە دیتن:

**١- داشۆرین و شەڕو جنێو ( جوێن ):** ئاخفتنێن نەشرین: ئەگەر ئەم بەرێ خۆ بدەینە دیوانا شێخ ڕەزای، دێ بینین زۆربەیا هۆزانێن وی، داشۆرین ئانکو هۆزانا (هەجوو)یە، ئەڤ بابەتە بابەتێ سەرەکی یێ شیعرین شێخ ڕەزای بوویە، ب هونەرەکێ بەرزو زمانەکێ ئاگرین هاتییە دارێژتن، ئاخفتنێن سەیرو سەمەرن، نەتنێ هەر شارەزا و پسپور و شیعر دوستان حەز لێ بوویە، بەلکو حەزا زۆربەیا خەلکی بوو، لەوا بوویە ئەگەرێ بناڤ و دەنگیا شاعری، ئانکۆ ئەگەرێ سەرەکی ژی ئەو هۆزانێن پڕ هەتك بەری وئاخفتنێن بێ پەردەنە، لەوا شاعر شانازیێ ب زمانێ خو دبەت و ل دۆر ڤێ چەندێ دبێژیت:-

تۆ هـــەتە تیغی دەبـــان، من هەمە تیغی زبـــان
فەرقـی ئەم دوو تیغە هەر وەك ئاسمـان و ڕێسمـان

(بۆ ژبەرکرنێیە)

کو دڤێ دێرێدا شێخ ڕەزا زمانێ شێعرێن خۆ ب تیغ دادنیت بەرامبەر خەنجەرا خەلکی و ئانکو یاوی تیژترە ژ یا وان.

هوزانێن شەرەدەڤ ئاخفتنێن نە شرین دناڤبەرا شێخ ڕەزای و شاعیرێ مەزن جەمیل لدقی زەهاوی) ژلایەکی و شێخ ڕەزا و شوکری فەزلی ژلایەکێ دیڤە، هەروەکی وان سەردەڤ ئاخفتنێن نەشرینە کو دناڤبەرا شاعیرێن عەرەب (جەریر) و (فەرەزدەق) هاتینە کرن.

بەلێ ئەڤ هۆزانە و هوزانێن دی نابنە جهێ سەر بلندیێ وئەو رووی مە

نینن دانینه سەر لاپەڕان و بنڤیسین لڤێرێ تنێ ڤێ هۆزانێ دێ ئێخینه بەر چاڤ ودەستێن هەوه کو تێدا گازندێ ژ (شێخ عەلی) دکەت و دبێژیت:-

١- بێگـــانه هـــەموو ســـاحیبی جـاهو جەبەڕووتن
بێچـــاره بـــرای (شێخ عەلی) موفـــلیس و ڕووتن

٢- ئەی شێـــخ عـــەلی چـــاکه وســووقت بەبرا بێ
باوەڕ مەکـــه بەم خەڵقه که وەک تووله لەدووتن

٣- قەومێ که له عەهدی پدەرت حەلقه به گۆش بوون
تـــەحقیقی بـــزانه به خـــودا جومله عەدووتن

٤- ڕەحمیـــان نییه دەربـــارەیی تـــۆ خزم و ئەقـارب
موشـــفیقتره بێگـــانه، لەمانـــه که عەمووتن

٥- نـــادان و قـــورمساغ نەزانن کـــه ئەمـــانه
گـــاهێ له سەما، گاه له سەیری مەلەکـــووتن

٦- ئەم تەکیـــه نشینـــانه چه دەروێش و چـه سۆفی
هەر چـــەنده بەدڵ موشتـــەغیلی زیکرو قنـــووتن

٧- وەک حـــاجی مابەینی (سەفا) و (مەروه) به تەعجیل
بۆ لوقمه ئەمـــانیش به مەســـەل یونس و حووتن

٨- جومعـــــانه بڕ اوه، بـــــه‌خودا موفـلیسه (لامیع)
نه پـــــوولی حه‌مــــامی هه‌یه نه‌پاره‌یی نووتن

(ژ سه‌ری چوار دێر بۆ ژبه‌رکرنێنه)

## ٢- نیشتمان په‌روه‌ری و شانازی ب خوّبرن:

شێخ ڕه‌زال دۆر نیشتمان په‌روه‌ریێ ژی شاعیره‌کێ بێ وێنه‌و هه‌مبه‌ربوویه، ددیواناویدا کۆمه‌کا هوزانێن وه‌سا دهێنه دیتن کو تێدا هه‌سته‌کێ نیشتمان په‌روه‌ریێ بلندو شانازییه‌کا بێ وێنه ل دۆر میرگه‌هێن بابان دبێژیت کو ل باژێرێ سلێمانیێ حوکمداری دکر، ئه‌وژی وه‌کی ره‌وشنبیره‌کێ هوشیار ئه‌ڤ چه‌ند زانیه کو ژ ناڤچوونا میرگه‌ها بابان زیان و زه‌ره‌را وی و میلله‌تێ وی تێدایه، له‌وا بێهنا خۆ دهه‌لکیشیت و ب هه‌سته‌کێ نه‌ته‌وه‌یی به‌حسێ (سلیمانیێ)ا پایته‌ختێ بابان دکه‌ت و دبێژیت:

١- له‌بیرم دێ سوله‌یمـــــانی که دارو موڵکی بابـــــان بوو
نه مه‌حکوومی عه‌جه‌م، نه سوخره‌کێشی ئالی عوسمان بوو

٢- له‌بـــــه‌رقاپی ســــه‌را سه‌فیــــان ده‌به‌ست شێخ و مه‌لاو زاهید
مه‌تـــــافی که‌عبه، بۆ ئه‌ربـــابی حاجه‌ت گردی سه‌یوان بوو

٣- له‌به‌ر تـــــابووری عه‌سکـــــــه‌ر ڕێ نه‌بوو بۆ مه‌جلیسی پاشـا
ســـــه‌دای موزیقـــــه‌و نه‌قـــاره تا ئه‌یوانی کـه‌یوان بوو

٤- دریَغ بۆ ئــەو زەمــانە، ئەو دەمــە، ئەو عەســرە، ئەو ڕۆژە
کــــە مەیــــدانی جرید بازی لە دەوری کــانی ئاسکان بوو

٥- بەزەربی حەملــەیێ بەغدای تەسخیر کــــردو تێی هەڵدا
سولــــەیمانی زەمـــــان ڕاستت ئەوێ بـــاوکی سولەیمان بوو

٦- عــەرەب ئینکـــاری فەزلی ئێوە ناکـــەم ئەفزەڵن، ئەمما
سەلاحــەددین کە دنیای گـــرت لەزومرەی کوردی بابان بوو

٧- قوبــووری پڕ لەنــووری ئــالی بابـــان پڕ لە ڕەحمــەت بێ
کــە بــارانی کــەفی ئیحسانیــان وەک هەوری نیسان بوو

٨- کـــە عەبــدەللا پاشــا لەشکری والی سنەی شڕ کرد
ڕەزا ئــــەووەختە عومــــری پێنج وشـــەش تیفلی دەبستان بوو

(ل دەستپێکێ چوار دێر بۆ ژبەر کرنێنە)

دشیعرەکا دی دا بێژیت:-

زوبدەی مەتاعی حیکمەتە ئەم شیعری کـــوردییە
هەرزانــــە بێ موبــــالەغە حــەرفێ بە گەوهەرا

(بۆ ژبەر گرنێیە)

دڤێرە دا دیسان ب هەستەکێ نیشتمانپەروەریڤە شانازی و سەربلندییێ ب زمانێ کوردی وپەیڤا کوردی دبەت و دبێژیت پارچەیا ڕەنگا و رەنگا ب بهایا حیکمەتی کو ئینایە مەیدانێ، شیعرا زمانێ کوردی پاکژتر ژوێ پارچە و هەر ژوی قوماشیبوو، ئەگەر هات و پیتەکێ بفرۆشی (تنێ ب زێری ژی)

چونکی ئەڤە بهادارترە هەردێ زەغەلی تێدا هێتەکرن، دیارە ئەڤ شیعرا، ئەز ددانم ئێکە ژوان شیعرێن کوردی یێن بهادار:

## ٣- پەسن ( مەدح ):

شێخ ڕەزا د مەدحکرنێژیدا دەستەکێ بالا هەبوویە کو وی مەدحێن هندەك کەسان کرییە، کێم شاعر هەنە دڤی بابەتیدا بگەهنێ، ئەڤە کو دەمێ مەدحێن کاك ئەحمەدێ شێخ دکەت ودبێژیت:

١- مەربووتە حەیاتم بە ســـــــولەیمانی و خاکی
خۆزگەم بە سەگی قاپییەکەی ئەحمەدی کاکی

٢- ئەوقدوەی ســـــاداتە کە سوکانی سەمـــــاوات
شەڕیانە لەســەرســـوجدە لەبەرمەقەدی پـاکی

٣- بۆ دەست وعەســــا نازگەکـــەی داخە دەروونم
قوربانی عەســـــی دەستی دەبم، سۆڵ و سیواکی

(هەمی بۆ ژبەرکرنێیە)

٤-دلداری (ئەڤینی):

شێخ ڕەزای رێکا شیعرا ئەڤینی ژی گرتییە وەکو هەمی شاعیرێن کلاسیزمی یێن مە، جوانترین شیعرا ئەڤینی یا کوردی نڤیسییە، ب سۆزەکا ڕاستەقینە و زۆر ب ڕاستبێژی، کۆمەکا شیعرێن ئەڤینی ددیواناویدا دهێنە دیتن، ئەڤە ئێکە ژوان شیعرێن تەڕو ناسکێن وی دێ بۆ هەوە بەرچاڤ کەین کو پێنج خشتەکییە لسەر شیعرەکا مستەفا کوردی:

دڵی بردم بەنـــازو عیشـــوە دیســـان، شـــۆخێ عەیـــارێ
فـــریبی دام سیحـــری چاوی خۆی مـــەحبووبێ، ســـەحارێ
لە هیجرانـــا تەقم کـــرد ئەی ڕەفیقان کوا مەدەدکارێ
ئەمـــان مردم عیـــلاجێ ســـا لەڕێی پێغەمبـــەرا چـــارێ.
ویساڵ یا قەتل و یا تەسکـین، لە هـــەرسێ بۆم بکەن کارێ

(بۆ ژبەرکرنێیە)

## ڕوخسارێن شیعرێن وی:

شێخ ڕەزا ب مەزنترین شاعیری کلاسیزمی یێ کوردی دهێتە دانان کو سەر ب قوتابخانەیا شیعری یا بابانە، چونکی ئێکە ژوان شاعیرێن کو ل باژێری کەرکووکی ل سەر ڕوخسارا شیعرێن نالی و سالم و کوردی هۆزانێن خۆ ڤەهاندینە، ئانکو د هۆزانێن وی دا ژلایێ ڕوخساریڤە ئەڤ خالە دهێنە دیتن:

١- ب زمانەکێ کوردی یێ تێکەل ب پەیڤێن (عەرەبی و فارسی و تورکی) هۆزان نڤیسینە.
٢-ب کارئینانا کێشەیێن (عەرووز) یا عەرەبی.
٣-ژلایێ سەروایێ ڤە ل دویف شیعرا کلاسیزما کوردی چوویە، ئانکو سەروایا ئێك پیتی بکارئینایە کو دبێژنێ سەروایا ئێکگرتی، ئانکو هەمی دێرێن وێ ب ئێك پیت ب دووماهی دهێن.
٤- پاراستنا بابەتێن غەزەلی و چامە (قەسیدە) دهۆزانێدا ول دویڤچوونا بابەتێن رەوانبێژی ئانکو یاریکرن ب پەیڤ و پەیڤەکا ری دهۆزانێن خۆدا.

## ناڤەڕوکا شیعرێن وی:

ژلایێ ناڤەرۆکێڤە ئەڤ خالە دهێنە دیتن:
١- دهۆزانێن خۆدا هەمی مەبەستێن هۆزانێ گوتینە هەر ژ پێگوتن هەتا ئەڤینی و مەدحکرن د شانازیکرنی ژبلی شیعرێن ئایینی و تەسەوف ژی هەنە، بەلێ دپێگوتن و ئاخڤتنێن نەشریندا پلەیا ئێکێ دهێت.
٢- هۆزانێن فارسی وتورکی گەلەك کارتێکرن لێ کرییە، ب تایبەتی هۆزانێن (حافزی شیرازی) مەزنە شاعیرێ فارس کارتێکرنەکا زۆر ل سەر هەبوویە.
٣-ئێکە ژ ژوان شاعیرێن کو سەر ب قوتابخانەیا بابان ڤە بوویە ئانکو سەر ب قوتابخانەیا شیعری یا نالی وسالم و کوردی، ب تایبەتی شاعیرێ مەزن (نالی).

# ناری

## ١٨٧٤ - ١٩٤٤ز

### ژیانا وی:

هۆزانڤانێ پایه بلندێ مه ناڤێ وی (کاکه حەمه)یه و کوڕێ مەلا ئەحمەدێ کوڕێ مەلا محەمەدی کوڕێ عەبدولرەحمانیه، ل سالا (١٨٧٤ز) ل گوندێ (کیکن) نێزیکی مەریوانێ هاتییه سەر دونیایێ، دژیێ شەش سالیدا، ل دەڤ بابێ خۆ دەست ب خواندنێ کرییه، قورئان و پەرتووکێن بچووك تەمامکرینه، پاش ژبۆ فەقیاتیێ ل دویف خواندنێ ل ڤان جهان (مەریوان، سنه، پێنجوین، سلێمانی، بانه، سابلاخ، وان، باشقەلا، هەولێر، ڕەواندز) گەریایه.

ل رەواندزی ل دەڤ مامۆستا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی موولەتا مەلاتیێ ل سالا (١٨٩٧ز) وەرگرتییه.

پاشی ڤەگەڕیایه ڤه مەریوانێ و ل وێرێ چوویه گوندێ بێلوێ نزیك مەریوان، یێ مژولی وانەگوتنێ بوو هەتا سالا (١٩٤٤ز) چوویه بەر دلوڤانیا خودێ ول گوندێ بێلوو هاتییه ڤەشارتن.

هۆزانێن نالی و مەحوی کارتێکرن لسەر ناری کرییه و تێلا سۆزا شاعیریێ لنك وی لڤاندییه ومێشکێ وی ژی مژویل کرییه، پەیڤا (ناری) یا بو خۆ هەلبژارتی ب نازناڤێ هۆزانێن خۆ.

ناری ئێکه ژ گوپیتکێن بلند و دیارێن رێبازا کلاسیزمی یا کوردی و ب بەرهەمێن خۆ یێن رەنگین ئەڤ رێبازە یا ئەدەبی گەشەدار کرییە.

## ڕۆخسارێن هۆزانێن وی:

١-کێشا عەرۆزا عەرەبی بکارئینایە.

٢-ئێکەتیا قافیێ پاراستییە.

٣-پەیڤێن عەرەبی وفارسی دهۆزانێن ویدا دیارن.

٤-گرنگی ب پەیڤکاری وخەملاندنێ دایە،دپەیڤ دەربڕینێو ئینانا پەیڤان شارەزاییەکا زۆر باش هەبوویە.

## ناڤەڕۆکا هۆزانێن وی:

ژلایێ ناڤەرۆکێڤە ئەڤ مەبەست و بابەتێن (ئەڤینی وخوشەویستی، مەدحێن ئایینی، نیشتمان پەروەری و نەتەوایەتی) ب ئاشکرایی دهۆزانێن ویدا دبرسقن.

**١- هۆزانێن ئەڤینی ( دلداری ):** ناری هۆزانێن ئەڤینی وخوشەویستی هەنە، ئەڤجا ئەڤ ئەڤینی یە یاراست بیت یان مەجازی بیت، یاگرنگ ئەوە، ب دل و دەروونەکێ پڕ ب جۆشەکا ئەڤینداری ئەڤ هۆزانێن ئاگرینی گوتینە.

١- چاوەکـــەم من بۆیە دایم کـــارو پیشـــەم زارییە
حـــاکمی چاوت لە گــــەڵ من مایلی غەددارییە

٢- شۆڕش و ناڵینی کـــەس بێ وە جهو بێ عیللەت نییە
ئاهی من فەریادی بولبول ئیـــشی بێ غـــەم خوارییە

٣- من هەر ئەو ڕۆژە دەســـــم شۆری لە ڕوحــــی خۆم کـەدیم
حـــــەزرەتی خوون خواری ئەبـرۆت مەشرەبی خوون خوارییە

٤- گـــــەر دەپرســـی بۆچـــی بێ نەشئەو مەلوول و عـاجزی
ڕوومـــــەتی زەردم عــــەزیزم شـــاهیدی بێ بـــتارییە

٥- کـــــەم بە خەندە بێ بەلامۆ حەیفـــە تەعنەم لـێ دەدەی
لێم گـــــەڕێ تو بێ و خـــودا ئەم جـــارە دەردم کـارییە

٦- دڵ لە شـــــامی پەرچـــــەمی ڕووتـــــا بەدایم بێ خــــەوە
چونکـــــە کێشکـــــچی لە شـــەودا عـادەتی بێدارییە

٧- حیکمـــــەتی پڕ مەسئەلەی کوڵمت لە بۆ کێ حەل دەبێ؟
هـــــەر سەحیفە سەد ئیشـــــارەو ڕەمزی تێدا جـــــارییە

٨- خـــاڵی ڕوخســـــارت هیدایەت بەخشە، شەرحی زولفەکەت
قـــازی ئاســـا حــــاشیەی ئەگـــریجەکـــانت لارییـــە

٩- ڕووت وەکوو ئاتەش موژەت وەک شیشە ئەبرۆت قیمەکێش
میرووەحەت زولف کــــەبابت جــــەرگی پـــارەی نـارییە

( ل دەسپێکێ پێنج دێر بۆ ژبەرکرنێنە)

٢- هۆزانێن ئایینی: ناری ب دلەکی گەرم و دەروونەکێ ب سۆزڤە هاتییە سەر بەحسێ مەدحێن ئایینی و گوتییە:

١- سوورەتی یـــاسین کە وەســـفی حەزرەتی لەولا دەکـا
ئەهلی دڵ مایـل بەجیلوەی ســـوورەتی تاهـــا دەکـــا

٢- خاکی بەر دەرگاهی قەسری گەر بەسەرداکا، گەدا
هـــەر نەفس نەفـــرەت لە تـاجی قەیسەرو دارا دەکا

٣- ئاسمـــــان وەک موشتـــەری هـــەر دەم بە میزانی وەفا
کـــــەسبێ هەر شـــامێ بەیادی دەولەتی ئەسرا دەکا

٤- گەر تەســـەورکا مەسیحی تـەختی عەرشی ئەعزەمی
تا ئەبەد تـەرکی بەیـــانی ڕەفعـەتی عیســـا دەکـــا

٥- نووری عیشـــقی تۆ لەســـەر توری دلــی موســا مەگەر
دای لەســـەر سینـــەی بە شەوقی دڵ یەدی بەیزا دەکا

٦- بۆ خـــەلیلان گـــەر نەسیمی گـــوڵشەنی لوتفت ببێ
نـــاری نەمردووی بە سەحنەی (جەننەتو لمەئوا) دەکا

( ل دەسپێکێ چوار دێر بۆ ژبەرکرنێنە)

**٣- هۆزانێن نیشتمان پەروەری:** ناری بناڤێ سۆزا ئاییینی بەحسێ نیشتمانی دکەت و ژهەمی دل و دەروونێ خۆ ئاخینکا بۆ نیشتمانی رادهێلیت ب وی شێوەی دبینیت:

١- ئەی خاکی وەتەن بۆچی نەما سەیرو سەفاکەت؟
بۆ زێڕو زەبەر بوو بەدەمێ، قەســری وەفاکەت؟

٢- بۆ گــوڵشەنی ئــاوابی مەحەببەت نییە ئەمڕۆ؟
بۆ ســـازە لەبۆ نەشتەری دڵ خــاری جەفاکەت؟

٣- بۆ دڵ بەدڵی مەیـــلی نەمـــاوە لە وەتـــەندا؟
بۆ ڕووی لەتـــەرەف قیبلە نەما قیبلە نوماکەت؟

٤- بۆ قاعیدەیی بو غـــزو حەسەد ســـازە لـەتۆدا؟
بۆ پاکی شکا، پەنجەیی ئیحسان و عەتاکەت؟

٥- ســـا بۆچی نەبی تۆ بــــە زرێباری مـەجووسی؟
یـــا چیهرەیی تۆ دیدە نەبینێ بە عــــەبووسی؟

( ژ دەسپێکێ سێ دێر بۆ ژبەرکرنێنە)

## ڕامانا پەیڤان:

کاروپیشەم زارییە : کاروپیشەیێ من گریانە.

خوون خواری : خویندارى ، خوین رێتن.

کێشکچی : نوبەدار.

ئاتەش : ئاگر.

میرۆوەحە : باوەشینك-پانك.

قازی : لاری : ناڤێ وی مصلح الدین لارییە، خەلکێ دەڤەرا لارستانە، پەڕاوێز لسەر گەلەك پەرتووکێن ئایینی هەنە.

جەرگی پارە : جەرگی هاتیە پارچەکرن.

جیلوە : خۆ دەرخستن.

موشتەری : ناڤێ ستێرەکێیە ل ئەسمانی.

خار : ستری ، درك.

زێروزەبەر : مەبەست پێ باژێرێ زرێبارە ، نوکە دەریاچەیە بناڤێ زرێبار ناڤدارە ل دەڤەرا مەریوان ل کوردستانا ئیرانێ.

بەعەبووسی : ب ناڤ چاڤ گرێیی ، ئەنی گرێ.

# زێوەر
## ١٨٧٥ز - ١٩٤٨ز

شاعیرێ پایە بلندو نیشتمان پەروەرێ کورد ناڤێ وی عەبدوللاّیە کوڕێ محەمەدێ مەلا ڕەسوولە، ل سالا (١٨٧٥ز) ل باژێرێ سولەیمانییێ هاتییە سەر دونیایێ، حوجرە و مزگەفت سەروکانیا بەهرەیا وی یا خویندنێ بوو، ژبلی زمانێ کوردی زمانێ فارسی وتورکی و عەرەبی دزانی وهۆزان ب هەمی زمانان هەنە، ئەو کاریگەرییێن ب سەر زێوەری ددیار ئەڤەنە:

١- زێوەر هەر د ژیێ گەنجاتییێدا دیمەنێن ڕەنگا و ڕەنگێن کوردستانێ کارتێکرن لسەر دڵ و دەروونێ وی کرییە وهەستێ وی یێ نازك لڤاندیە.

٢-تام وبێهنا شیعرێن مەولەوی و نالّی چوویە دناڤ هەمی دەمارێن ویداو، تێلێن سۆزا وی لڤاندینە.

٣-دیوانێن شاعرێن فارسی ژی کارتێکرن لێ کرییە وهەستێ وی لڤاندییە، وەلێ کرییە حەزو ڤیانا وی بەرەف شیعرێ بچیت.

٤-هەروەسا زۆلم وزۆرداریا ڕۆژانێن بن دەستیا نەتەوەیێ کورد هندی دی دلێ وێ ئازراندیە وبەرەف هەمبێزا شیعرێڤە برییە وئیلهاما شیعرێ پتر ل دەف وی موکمتر لێ کرییە.

پەیڤا (زێوەر) ب خۆ هەلبژاراتییە و کرییە نازناڤێ هوزانێن خۆ، ل رۆژا ١٠/١١/١٩٤٨ ل باژێرێ سولێمانییێ دژیێ (٧٣) سالیدا مالئاڤایی ل ڤێ جیهانێ کرییە ول گرێ سەیوان هاتییە ڤەشارتن.

هۆزانێت وی ل دۆر (ئەڤینی و خوشەویستیێ، وەسفا سرۆشتی، جڤاکی، نیشتمان پەروەری ونەتەوەیی، فێرکرن وهاندان بۆ خواندنێ و پێشکەفتنێ، فەلسەفە)بوون، ئانکو ژلاییێ مەبەستێ ڤە ب ڤی جۆری بوون:

١- زێوەر وەکی شاعیرێن دی ل دەستپێکێ دکەڤیتە مەیدانا ئەڤینێ وخوشەویستیێ دوی بیاڤیدا هەستێ هزرو خەیالێن خۆ حەواندییە، پەلاتینکا ئارەزۆیێن وی درەنگترین باغچەدا دادایە، بیرا هویر و خەیالا ناسك وسۆزا گەرم وب تێهن دهۆزانێن ویدا ددیارن، ئێکە ژ شاعیرێن رێزا پێشیێ یا بابەتێ هۆزانا ئەڤینی د ئەدەبیاتێن کلاسیزما کوردیدا.

بەرێ خۆ بدێ کا چاوە وەسفا یارا خۆ دکەت ودبێژیت:

١- تکـــــانی ئابرووی چــــەمەن بـــەڕووی ئـــابدارەوە
شکـــــانی نرخی نەستـــەرەن بە زولفی مشکبـــارەوە

٢- چمەلەمەی؟ لە نەی! لوجام ئەگـــەر بەلەنجە بێتە لام
بـــەڕووی تـــابدارەوە، بەچـــاوی پــڕ خومـــارەوە

٣- عـــــەرەق نییە لە عـــالەما کە لابەرێ لە دڵ غەمـا
بە غەیری قەترە عـــارەقێ لە ڕووت کـەدێتە خوارەوە

٤- نیشـــــانی من، جەمـــــالی تۆ، بەراتی من، ویســـاڵی تۆ
خەیـــــــاڵی من خـــاڵی تۆ، بە عیشــوە لێم مەشارەوە

٥- عەزیزەکەی حەبیبی من، نیگـــارەکـــەی تەبیبی من
با شــــەق بـــــەرێ ڕەقیبی من، وەرە بەســـەد ویقارەوە

٦- فیــــدا خەوو قەدی تۆ، چەمـــــەن بە فـەوجی گوڵیەوە
بە بولبــــــول و بە چڵیەوە، بە قـــــومری و چنـــارەوە

( ژ دەسپێکێ چوار دێر بۆ ژبەرکرنێنە)

٢- زێوەر بەحسێ جوانیا سرۆشتی کرییە کو ب دەستەکێ کاریگەر نەخشاندییە، بەرێ خۆ دایە وی دیمەنی، کو ل بەهارێ هاتییە خەملاندن، دڤی باریدا دبێژیت:

١-بنـــــوارە نـــەو بەهـــــارو هــــەوای تـــەڕاوەتـــی
نووســـــانی پێکــــــەوە لــەبی غونچەی حــەلاوەتی

٢-هێنایە شــــەوق و زەمزەمە، تەیـــرانی سەر زەمین
ســــەرمــا بڕایەوە، هەمـــــوو توندی و ســەلابەتی

٣-هــــەورە تریشقـــــە بۆتە ســـــەقا ئـاوڕشێن ئەکا
تا ســــــەبزە زاری ئەرز موجــــەلابێ ســـــەفــوەتی

٤- ئەم عـــەردە مـردووە هـــەموو ڕۆحی کـــرایە بەر
گۆڕاوە ســـەربەســـەر هەمـــوو دونیا قیـــافەتی

٥- بـــادی سەبـــا بەجیلـــوە قەدی گـــوڵبەنی لەران
گـــوڵ زاری کـــردەوە کە بکا شوکری نیعمەتی

( ژ دەسپێکێ دوو دێر بۆ ژبەرکرنێنە)

٣-دبیاڤێ جڤاکیدا وی ب چاڤ ددیت یاسا دهاتە پێشلکرن و تێکدان وهەر لایەکی تۆ بگری یان تە دڤێی بچییە ناڤ، دێ بینی ژ ئەوێن دی خرابترن، هەمی ئامانج یێن هاتینە سەر پارەپەرستنێ و دوورکەفتینە ژ وژدانێ، دڤی بیاڤیدا وەکی شارەزایەك شیرەتا ل خەلکی دکەت ودبێژیت:

١- یەک عـــەیبی خەڵک ئەبینی خۆت ســـاحیبی هـەزاری
خەڵکت لـــەلا خـــەرارە خۆیشـــت وەکـــو دەواری

٢- زاهیر فەقیرو ســـالم، بەڕەنگ و بەرگـــی عـــالم
ئەممـــا لەنـــاو دەروونـدا مـــارێکی زەهـــرداری

٣- چـــۆن پێت بڵێم موسولمـــان یان فەردی نەوعی ئینســـان
دووری لە خێرو ئیحســـان مەستـــی مەی و قومـــاری

(تنێ دێرا ئێکێ بۆ ژبەرکرنێنە)

٤- دبیاڤێ هەستێ نیشتمان پەروەری و نەتەوەیڤە، زێوەری ددیت ئەڤە نەتەوەییێ وییە یێ ل ژێر بارێ ستەم و زۆریا زەمانی وناحەزێن رۆژانە دنالیت و مافێ وی دهێتە خوارن، یێ دوورە ژ هەمی نازو نیعمەتەکێ، یێ دوورە ژ ژیانا خۆشییێ و ئازادییێ، ژبۆ رزگاربوونێ ژڤێ جۆرە ژیانێ، شاعیری داخوازا خەباتێ و برایەتییێ و زانستی و خۆیندەوارییێ کرییە، ئەڤە کرییە بنیاتێ سەرکەفتنێ و گوتییە:

١- وەتەنێ مە کوردستانە یادگاری ئەجدادمانە
بەهەشتی سەر ڕووی زەمین خاکی پاکی کوردستانە

٢- با هەموومان وەک برابین، ڕەفیقی دین و دونیابین
با لەوەحشەت تەوەلابین، نۆبەتی عیلم و عیرفانە

٣- کورد میللەتێکی ناسراوە، لە مەعاریف بەجێ ماوە
ڕۆژی سەعی و تێکۆشینە بۆ ئەو کەسەی کوردزمانە

٤- کورد میللەتێکی قەدیمە، ساحیبی تەبعی سەلیمە
شاهیدی ئەم مودەعایە سەلاحەدینی سوڵتانە

(ژ دەستپێکێ دوو دێر بۆ ژبەرکرنێنە)

٥-زێوەر دهێتە سەر بەحسێ وردەکاریێ و پەیڤ سازیێ دزمانێ کوردیدا، ب ڕاستی گۆهێ هونەری بڕییە و ڕەوانبیژی یا زمانێ کوردی دەرخستییە، ل سەر رێکا نالی چوویە، بگرە تاکەترازیا لگەل نالیدا ڕاست کرییە، وەکو وی گوتی:

١- بـــا نەچێتە لای ڕەقیبـــان یـــار ئەنیـــسی خـــانەبێ
لازمـــــە ئەو ئـــاسکە لەولانـــەبێ، لەولانــــەبێ

٢- دیـــــدە وەختێ تۆی لەلا حــــازر نەبێ وا حەز ئەکـــا
بۆ نــــەزەر لەعل و دوڕی یەکتــــانەبێ، یەکتــانەبێ

٣- عــــارفی حەق بین چ بــــاکی زینــەت و ئـــارایشە
وای ئەوێ نـــاو شـــارو نــــاودێ وانـــەبێ، دێوانەبێ

٤- دۆستـــــی و خـــــزمی نەمـــاوە بۆ رەفیقی خۆێ فەلاح
حەز ئەکـــا بەو شەرتە گەر بێ گانەبێ، بێگانەبێ

٥- هەر کـــەسێ بۆ تەرکی دلبەر دێ نەسیحەتمان ئەکا
ئەم دوعــــایەی لێ ئەکـــەم یاخوا نەبێ، یاخوا نەبێ

٦- شـــــەمعی ڕووتە بۆتە بـــاعیس زێوەر ئێستـــا دائیمـا
گـــەر لە خـــاتریا کـــەمێ پەروانەبێ، پەروانەبێ

( ژ دەسپێکێ سێ دێر بۆ ژبەرکرنێنە)

## رامانا پەیڤان:

تکانی : ئاڤ ژێ دهاتە خوارێ.

ئابڕو : حەیا

چەمەن : باغچە، مێرگ.

ئابدار : ئاڤی، ئاڤدار.

شکانی : بهایێ وێ کێم کرییە، شکاند.

نەستەرەن : گولەکا بێهن خۆشە، رەنگێ وێ سوورە یان سپییە.

تابدار : هەتاڤ.

خومار : ناز، نازك.

رەقیب : نەحەز، دوژمن.

ویقار : ناڤ سال قەچوویی.

ئەنیسی : هۆگری

ئاسك : مامز، غەزال.

لەولا نەبێ(١) : ژلایێ دوژمنا نەبیت.

لەولانەبێ(٢) : ژلایێ هێلینا خۆ بێ کمالە.

یەکتا نەبێ(١) : بێ هەمبەر نەبیت.

یەك تا نەبی(٢) : تانەیەك بسەرڤەبیت.

دێ وانەبێ(١) : گوندێ وەسا نەبیت.

دێوانەبێ(٢) : شێت بیت، دین بیت

بێ گا نەبی(١) : بێ گایێ جووتی نەبیت.

بێگانەبێ(۲)    : خەلکێ دەرڤەی دەڤەرێ بیت، بیانی بیت.

یاخوا نەبێ(۱) : یا خودی ئەو کەس هەر نەبیت.

یاخوا نەبێ(۲) : مەرەم پێ (خوانە) شێت بیت، کو کابرایەکی شێت بوویە.

پەروانەبێ(۱)  : بێ پەروا، بێ ترس.

پەروانەبێ(۲)  : بلاببیتە پەروانە.

**تێبینی:**

۱-بۆ نڤیسینا ڤی بابەتی مفا ژڤان ژێدەران هاتییە وەرگرتن.

أ-مێژووی ئەدەبی کوردی: مامۆستا عەلائەدین سوجادی.

ب-دیوانا زێوەر: پەرتووکخانەیا زێوەر محەمەد عارف.

## شێرکۆ بێکەس

کوڕێ شاعێرێ بناف ودەنگ و نیشتمانپەروەرێ کورد (فایەق بێکەس) ە. ل سالا ١٩٤٠ ل باژێرێ سلێمانییێ ژ دایك بوویە، ئێکەمین شیعرا خۆ دژیێ هەڤدە سالێدا بەلاڤەکرییە. ل سالا ١٩٦٨ ئێکەمین کۆمەلا شیعرێن خۆ بناڤێ (تریفەی هەڵبەست) ل بەغدا چاپکرییە. ل سالا ١٩٧٠ دگەل دەستەکا شاعیرو نڤیسەرێن دی بانگەوازا ئەدەبی (روانگە) بەلاڤکرییە. نویکرن درۆخسارو ناڤەرۆکدا مەرەما سەرەکیا روانگەیا وان بوو، پشکداری دشۆرەشا رزگاریخوازا مللەتێ خۆکرییە. هەتا نوکە پتر ژ چواردە کۆمەلێن شیعری ب زمانێ کوردی بەلاڤەکرینە. شانۆ نامە و چیرۆکە شیعرو داستانا شیعری نڤیسینە ل سالا ١٩٨٧/١٩٨٨ یانەیا قەڵەمێ سویدی خەلاتێ ئەدەبی تۆخۆلسکی دایێ. هەلبژاردەك ژ شیعرێن وی بۆ کەلەك زمانێن بیانی هاتینە وەرگێران وەك ئنگلیزی، ئەلمانی، فەرەنسی، ئیتالی، سویدی، تورکی، عەرەبی، فارسی ویێن دی.

شێرکو بێکەس چەوا دشیعرێدا یێ دەست هەلبوو، هەروەسا دپەخشانێ ژیدا کێم وێنەیە، دپەیڤەکێدا و دکتێبا چرایێن سەر هەڵەمووتدا، دبێژیت:

ل دەسپێکا گرتنا قەلەمی وب دیتنا ئێکێ یا پێشکەفتنا بەهرەیێ د شیعرێن (تریفەی هەلبەست)دا و هەتا ئەڤرۆ، ناڤێ قوربانییێن ئازادیێ و خوینا دەڤ ب هەوار وپاشی سیحرا جهـ و جوانیا سرۆشتی وگازیا سروودێن مەیێن

میللی ونەتەوایەتی ونیشانێن ئاخ و دیرۆکێ، داستانێن خۆ گوری کرن، مەرگێ یاران و عەزیزان و زنجیرا دیرۆکا تراژیدیا مللەتێ کوردو وهەروەسا مرۆڤایەتیا دنیایێ ژی، دشیعرو پەخشانێن مندا نیشانێن هەرە دیارییێن ئەڤین و پەیامێ ئەدەبیێ گیانێ من بوون. چێدبیت خۆشتڤیا ئاخ و مرۆڤایەتییێ ئەز کربمە شاعیر، چونکو ئەز دوێ باوەرێدامە ئەدەب وهونەرێ خەلکی بێ خۆشتڤیا خەلکی هەکەیا جوان ژی بیت، وەك گولدانەکا خالی و خانیەکی چۆلە! هەردەم حەزا من ئەو بوو ئەدەبێ بنڤیسم ژدلی بۆ دلی بیت دا بشێم دەربڕینێ ژ وێ حەزێ ومەرەم وخەیالا بکەم کو ددلێ خەلکیدانە و ئەو نەشێن دەرببڕن، ئەز ب رەنگەکێ دی بەرچاڤ بکەم.
ئەزموونا من یا دویر ودرێژ ئەز فێری هندێ کرم هەکە دڕحا زمانێ خۆدا نەژیم چ جارا ئەز دڕحا چ زمانێن دی یێن دنیایێدا ناژیم.

## ئەڤەژی چەند نموونەکن ژ هۆزانێن وی:

### ١- خاك

دەستم برد بۆ چڵی دارێ

لەناو ئازار لق دا چڵەکی

کە دەستم برد بۆ لقەکە

ناو قەدی دار کەوتە هاوار

کە باوەشم کرد بە قەدا

خاك لەرییەوە لەژێر پێمدا

بەرد نالاندی

ئەمجارەیان کە دانەویم

خۆڵم هەلگرت

گشت کوردستان زریکانی

### ٢- خۆشەویستی

گوێم نا بەدڵی خاکەوە

باسی دڵداری باران و خۆی بۆ کردم

گوێم نا بەدڵی ئاوەوە

باسی خۆشەویستی خۆی و

سەرچاوەکانی بۆ کردم

گوێم نا بەدڵی دارەوە

باسی خۆشەویستی خۆی و

گەلاکانی بۆ ئەکردم

کە گوێشم نا بەدڵی خۆشەویستی خۆیەوە، ئەوسا

باسی سەربەستی بۆ کردم!

## ٣- سێ زمان وچوار قامچی

لەناو ئاپوورەی مەراقی گشت دنیادا

هەر لە دوور ڕا

مەراقی خۆم ئەنسمەوە

مەراقی من!

قژی سەوزەو

ڕیش خوێناوی و

چوار خاچی وا بە کۆڵەوە

مەرگیش بەسێ زمانی جیاو

چوار قامچیی بەدوایەوەو

تەوق لە گەردن

کەچی نەچۆک دا ئەدات و

نەبێ دەنگی ئەکات مردن!

**تێبینی**: تنێ دوو کۆپلە بۆ ژبەرکرنێنە

# شێخ غەیاسەدین نەقشەبەندی

## ١٨٩٠ - ١٩٤٤

غەیاسەدین نەقشەبەندی کورێ بەهائەدین کورێ شێخ محەمەدێ کورێ مەلا حاجیێ رێکانییە. ئەڤ بنەماڵە ژ (رێکانێ) ل ناڤ رێکانییا مشەختبوویە ول ئامێدیێ پایتەختێ میرگەها بەهدینان ئاکنجی بوویە. ئەڤ بنەماڵە ل دەڤەرا بەهدینان ب بنەماڵەکا رەوشەنبیرو ئۆلدار وژ خودێ ترس ناڤدارە.

شێخ محەمەد ژ ئامێدیێ چوویە گوندێ (بامەرنێ) ولێ بنە جهـ بوویە. تەکیایەکا نەقشەبەندی ل بامەرنێ دانا، پاشی شێخ محەمەدێ کورێ وی (بەها ئەدین) بابێ غەیاسەدین بوویە شێخێ تەکیایێ.

شێخ غەیاسەدین ل سالا (١٨٩٠ز)ی ل گوندێ بامەرنێ ژدایك بوویە و ل وێ مالا ئۆلدار ژیایە و پەروەردە بوویە، ئەو ژی وەك هەمی خویندکاران ل دەسپێکا خواندنا خۆ دەست ب خواندنا پەرتووکێن ئایینی ژ (شەریعەتێ وفقهێ) ل جەم زانایێن دەڤەرێ وەك مەلا نەجمەدینێ ئیمام وسەیدایێ تەکیایێ، ل بامەرنێ خواندییە، پاشی چوویە ئامێدیێ و دوستویریا عالمیێ ل سەر دەستێ (محەمەد شوکری) موفتیێ ئامێدیێ وەرگرتییە.

دژیێ پیریێدا دەست ب ڤەهاندنا هۆزانا کرییە، ئەو هۆزانێن ڤەهاندین هەر چەندە دکێمن لێ هەمی دپڕ ڕامانن، گەلەك ب شارەزایی ڤەهاندینە ژبو شیرەتکرن و رێ نیشادان و پەسەندکرنا رەزشەنبیریێ.

غەیاسەدین مرۆڤەکێ تێگەهشتی و زانا و دووربین بوویە، دزانی پێشکەفتن و ڤەژینا مللەتی ب خواندن و بەلاڤەکرنا رەوشەنبیریێ وقڕکرن و نەهێلانا نەزانینێ ب ئێکبوونێڤە گرێدایە، دەمێ دبێژیت:

١- ئەگـــەر هوین موتەفــق بن علم وفەن وسنعەتا بخوینن
چــو شک نینە ســـەعادەت بۆ وە دێ هێن بێ زەحمـەت

٢- کـــورێ بــابێ ئەوە، دەستێ هەڤالی بگریت و ڕاکەت
هــەکە کەفتە کوورا تەنگاڤیێ خشیانە سەر زیقەت

٣- کـــورێت بابا تفەنگـــا دانن و دەستــا سڤک هەلدەی
هـــەوە ئەڤرۆ قەلەم لازمتـــرە داکـــو بهێت فــــەرست

٤- کـــورێت بابا ئەگـــەر هوین بوونە زاناو تفاق ژیەک
دهێت تەیــارە بۆ وە پێش تڤەنگێڤە نەکەن حەسرەت

( ژ دەسپێکێ سێ دێر بۆ ژبەرکرنێنە)

ژبەر هندێ بزاڤ وخەباتا وی یا ژ دل ڤەکرنا خواندنگەهان بوو ل دەڤەرا بەهدینان ب تایبەت ل ئامێدیێ وبامەرنێ.

هەروەسا زۆر خەبات کرییە داکو مللەت و نەتەوەیا کورد بو لاوێن کورد بدەتە نیاسین دەمێ دبێژیت:

١- کورێت بابـــا بزانن حـــەق چییە مەوتـــەن چییە ئـــەڤرۆ
هـــەوەل ســـەر لازمە هویـــن تێبگەهن عنوانە قەومیەت

٢- چو گـــازاندا ژ زەمانی هوین نەکەن ئەو هەر شەڤ و رۆژن
وەکـــی خۆیە بـــەلێ ســـویچا مەیە ئەم بووینە بێ قیمەت

٣- گـــەلی لاوا وەتـــەن دەینێ خۆیێ دخـــازیت ژ دێ دەیـــنێ
هـــــەچی تشتێ بـدەین مالێ وبیــــە بێ خێـــرو بێ منـــەت

(هەمی بو ژبەرکرنێیە)

غەیاسەدین ل سالا (١٩٣٠ز)ی بوو نوێنەرێ قەزا ئامێدیێ ول سالا (١٩٣٥ز)ی ئەڤ نوێنەرییە بۆ هاتە نویکرن.

ل دەمێ جەنگا دووێ یا جیهانێ چوویە بەر دلوڤانیا خودێ.

سالا مرنا وی، هۆزانڤانێ کورد یێ ب ناڤ و دەنگ (ئەحمەدێ نالبەند) دهۆزانەکا پێگوتنێدا دەست نیشان کرییە کو سالا (١٣٦٣)ی مشەختییە بەرامبەر (١٩٤٤)ی زایینی دەمێ دبێژیت:

دهـــزارو سێ ســـەدو شێســـــت وسێ یـــا چـــوو غیـــاپ

هجـــرەتـــاوی ژڤێ دنێ وەک عومـــرێ (ختـم المرسـلین)

عومـــرێ فەخـــرێ عاڵەمێ مرنـــا غیـــاپی بـــوونە ئێـک

سڕەکـــا کـــو (پڕ) نـــەزانی ئـــەحمـــەدێ (ابن الامین)

غەیاسەدین دڤەهاندنا هۆزاناندا رێکا هۆزانڤانێن کلاسیکی گرتبوو، ئاخفتن و زاراڤێن بیانی بکار ئینایەنە.

نموونەیەك ژ هۆزانا غەیاسەدینی کو ب خەباتا نەڤیێن بەدرخانی و بەلاڤەکرنا کەلتوورو رەوشەنبیریا کوردی ڤەهاندییە: ب ناڤێ بەدرخانی.

١- خۆشـــی ئـــــەڤە هـــات و هەمیـــا مل ل ســـەمـــایە

کـــەیف و کەنییە ئـــەڤرۆ چ نعمـــەت خـــودێ دایـــە

٢- علـــم ئەدەبـــا گـــرتی ســـەراســـەر جهێ کـــــوردا

بەر بـــــوونە دوڕو ئـــاخ هـــــەمی زێڕی ســـەفـــایە

٣- خـــــۆشی نە ئـــەوە پاخـــلێ تژی کـــەی ژ دەراڤـــا

دل خـــــــۆشی نەبیـــــت مـــاڵ هـــەمی دەردو بەلایە

٤- کـــــا خۆشی وەکـــــی فکـــرە ئەســـــیر مـــا ل دەماغا

مـــــا بۆچییە ژیـــــن وەقتێ کـــــو ئـــــەزمـــانێ بڕایە

٥- سـه‌ربه‌ستییه ئینسـانی دگیـڕیت ب سـه‌عـادەت

ئه‌منیـه‌تـه بۆ بزنێ دکـه‌ت گـورگی بـرایه

٦- ئه‌ڤرۆ خه‌بـه‌رێ خـۆش مه گوه لێ بوو کو به‌درخان

سـاخبوو ڤه دشـه‌خسێ نه‌ڤیـادا ڤه‌گـه‌ڕایه

٧- هندیکـه جـه‌لادەت ب جـه‌لادەت وه‌کی شیـڕا

کـامیران ژی ب کـه‌مال و ئـه‌دەبا میرێ هه‌مایه

٨- بۆ جـه‌نگ و جـدالا وه‌کـی شیـڕان وپڵنگـا

وه‌خـتێ قـه‌لـه‌مێ دوڕ وه‌کـی لێمشتـێ ڕژایـه

٩- ئه‌ڤمللەتـه دێ گه‌نگی حـه‌قێ قـه‌نجیێ ڕاکـه‌ت

یـا ژهه‌میا سڤکتـر ب گـرانی یـاخو چیـایه

١٠- یـاره‌بی حفزکـه‌ی ئـه‌ڤی مللـه‌تێ موحتـاج

ڤـان هـه‌ردوو عه‌زیزان کو کـه‌سێ دی مه نه مایه

١١- که‌یفـێ دلـێ ڤی پیره مه‌لایی ڕاکـره ڕه‌قسی

مـاپیر وه‌کی جـان بـوون ڤه؟ که‌ره‌م کارێ خودایه

( ژ ده‌سپێکێ پێنج دێر بۆ ژبه‌رکرنێنه)

## ژێــدەر:


١-گۆڤارا (هاوار) ژمارە (٥٠) سالا ١٩٤٢

٢-هۆزانڤانێن کورد -سادق بەهائەدین -چاپا ئێکێ-بەغدا -١٩٨٠


## رامانا پەیڤان:

مشەخت بوویە : دەربەدەر بوویە.

ئاکنجی بوون : بنەجهـ بوون.

ئۆلدار : دیندار.

ل جەم : ل دەف.

ژی : عەمر، تەمەن.

لێ : بەلێ.

قڕکرن : ژناڤبرن.

موتفق بن : رێك بکەڤن.

بۆ وە : بۆ هەوە.

زیقەت : تەنگاڤی.

خشیانە سەر : بسەردا هات.

بزاف : خەبات.

فەرسەت : دەلیڤە.

حەسرەت : دلتەنگی.

حەق : ماف.

مەوتن : نیشتمان

عنوان : ناڤ و نیشان.

بێ قیمەت : بێ بەها.

دەین : قەرز.

سڕەك : نهێنیەك.

دەراڤ : پارە، دراڤ.

قەومیەت : نەتەوە.

هجرەتا وی : وەغەرا وی.

سەما : داوەت.

حفزکەی : بپارێزی.

# شێخ محەمەدێ خالٚ
## ١٩٠٤ - ١٩٨٩ز

### کورتیەك ژ ژیانا وی:

زانا و نڤیسەرێ مەزن ناڤێ وی (محەمەد کوڕێ شێخ عەلی کوڕێ حاجی شێخ ئەمین کوڕێ شێخ محەمەدێ خالٚ)ە. ل سالاٚ (١٩٠٤)ێ زایینی ل باژێرێ (سلێمانییێ) ل تاخێ گوێژە ژدایك بوویە، ل ١٩٨٩/٧/١٥ هەر ل باژێرێ سلێمانییێ چوویە بەر دلوڤانیا خودێ و ل گرێ سەیوان تەرمێ وی یێ پاقژ هاتییە ڤەشارتن.

شێخ محەمەدێ خالٚ ژبنەماڵەکا ئایین پەروەرو زانا بوو، هەر ژ زارۆکینییێ مژویلی دەرس خواندن و مزگەفتێ بوو. دەستویریا مەلاتییێ وەرگرتییە، بوویە (مامۆستا) ل مزگەفتا حاجی شێخ ئەمین، کو مزگەفتا وان بوو، ل سالاٚ ١٩٣٩ بوو (قازی) ل باژێرێ (سلێمانی، کەرکووك، مویسل) ل سالاٚ ١٩٦٧ دەست ژ کاری بەردا، ل سالێن (١٩٧٠-١٩٨٩ ) ئەندامێ (کۆڕی زانیاری عێراق) و (کۆڕی زانیاری کوردی) بوو ل بەغدا.

### بەرهەمێن وی:

شێخ محەمەدێ خالٚ زانایەکێ شارەزا و تێگەهشتی و شیاندار بوو.

رێبازا رەوشەنبیری و خزمەتکرنا زمان و ئەدەبیاتێ نەتەوەیا کوردی گرت.

بەردەوامبوو ل سەر ڤێ رێبازێ هەتا رۆژێن دوماهیێ ژ ژیانا خۆ.

باوەری ب دوو تشتا هەبوو، ئێك موسلمانەتی ب گشتی، دوو نەتەوەیا كورد ب تایبەتی، زەڤیا پیرۆزا رەوشەنبیریا (خاڵ)ێ زانا درامەتێ هەمە جۆرێ كەلەپوورێ كوردی تێدا دەركەفتییە، ژڤی لایڤە مامۆستا (خاڵ) گەلەك بەرهەمێن بهادار هەنە چ ب زمانێ كوردی چ ب زمانێ عەرەبی ژوان (شێخ معروف النودهی) كو ب زمانێ عەرەبییە بەحسێ بەرهەم وخزمەتێن زانایەكێ مەزنێ كورد دكەت ب زمانێ عەرەبی، هەر وەسا كتێبەكا دی ب زمانێ عەرەبی ل سەر (المفتی الزهاوی) هەیە.

ب زمانێ كوردی ژی كۆمەڵەكا بەرهەمان هەیە ژوان (فەرهەنگی خاڵ) كو ب سێ بەرگا چاپكرییە وفەرهەنگەكە ژ كوردی بۆ كوردییە. بەرگێ ئێكێ ل ساڵا ١٩٦٠ چاپكرییە ل سلێمانیێ وبەرگێ دووێ ژی ل ساڵا ١٩٦٤ هەر ل سلێمانیێ چاپكرییە، بەرگێ سێیێ ژی ل ساڵا ١٩٧٦ چاپكرییە، هەتا نوكە ب ئێك ژ فەرهەنگێن باش یێن زمانێ كوردی دهێتە دانان، كو شیایە گەلەك پەیڤێن زمانێ كوردی دڤێ فەرهەنگێدا كۆم بكەت، ب ڤێ ژی بوویە گەنجینەكا دەولەمەندیا زمانێ مە و ب ژێدەرەكێ مەزن دهێتە هژمارتن بۆ فەرهەنگێن دی كو پشتی وێ هاتنە چاپكرن، بەرهەمەكێ دی یێ مامۆستا (خاڵ) كتێبا (پەندی پێشینان)ە، هەتا نوكە سێ جارا هاتییە چاپكرن، جارا ئێكێ ل ساڵا ١٩٥٧ بەلاڤەكرییە كو (١٣٠٨) پەند تێدایە، دڤی سامانیدا رەفتارا تایبەتی و هزركرنا مللەتێ كورد و رەوشا جڤاكی وژیانا روون وئاشكەرا دیارە.

شاكارێ مللەت و نەتەوەیا كوردە، ئەوی رێك خستینە، ل سالا ١٩٧١ هەر ئەو كتێب چاپكرییە و ژمارا پەندا زێدەتر لێكرن و گەهاندنە (٣٨٩٣) پەند، ل سالا (٢٠٠٠) زایینی دیسان ئەڤ بەرهەمە ب چاپەكا جوانترو قەشەنگتر ل باژێرێ سلێمانییێ هاتە چاپكرن، ئانكو جارا سێیێ كو ئەڤ بەرهەمە وەك خۆ گەنجینەكا پڕ گەوهەرە، هەتا نوكە ب پاڤژترین كارێ كۆمكرنا (پەندێ پێشینان) دهێتە دانان كو ل كوردستانێ هاتبیتە كرن و زۆرترین ژمارا پەندێن كوردی تێدا هاتبنە كۆمكرن.

هەروەسا مامۆستا (خالێ) ب سەدان گۆتار بەلاڤەكرینە دگۆڤارو رۆژنامێن كوردیدا لدۆر زمان و ئەدەب و رەخنە و ئایین و تەسەوف، ژبلی وان بەرهەمێن مە بەحسكرین.

ئەڤ بەرهەمە ژی هەنە كو مستەكن ژ بێدەرەكێ:

١-فەلسەفەی ئایینی ئیسلام -١٩٣٨

٢-تەفسیری خالێ -جزئێ ئێكێ -١٩٦٩

٣-تەفسیری خالێ -جزئێ دووێ -١٩٧٢

٤-مەولوودنامە -١٩٧٢

٥-ناگەی دەروون -١٩٧٦

ژبلی ڤان بەرهەمان شێخ محەمەد خالێ دەستنڤیس و چاپەمەنیا بژارە یا كتێبخانا خۆ بەلاڤەكرینە، هاتییە و چ دەستنڤیس و چاپكریێ بژارەیێ بهادارێ د كتێبخانا ویدا هەیە چ ب زمانێ كوردی یان عەرەبی یان فارسی

یان تورکی هەمی ب شێوەکێ لیستە بەلاڤەکرینە کو تێدا خەتێ وێ خۆشە یان ناهێتە خواندن، کارتەمامە یان کێمە، ژمارا بەرپەرا چەندە کو ئەڤە ژی ب بەشەکێ گرنگیدان ب کەلەپورێ نەتەوایەتی دهێتە هژمارتن. شێخ محەمەد خالێ ئێك بوو ژ پەخشان نڤیسێن شیاندار کو زمانەکێ پاقژو زەلال ورەهوان دنڤیسی، لڤێرە دێ پارچە نڤیسینکەکا وی بەلاڤەکەین کو گۆتارەکا ڕەخنەیی یە. ل دور دیوانا شاعیرێ مە یێ پایەبەرز شێخ رەزایێ تالەبانی نڤیسییە و دگۆڤارا (کۆڕی زانیاری کورد)دا بەرگێ بیستێ هاتییە بەلاڤەکرن مرنا وی ل سالا ١٩٨٩.

((داخی گیانم ئەگەر شیعری هەموو شاعیرەکانمان کۆبکرانایەتەوە لە وەختی خۆیا، ئێستا بەسەدەها دیوانمان ئەبوو، بەڵام بەداخەوە لەهەزارا یەکێکیان شیعریان نە نووسراوە کۆنە کراوەتەوە، لەگەڵ مردنی خویان، شیعرەکانیشیان مردوون و نێژراون، وە بەبێ ناونیشان چونەتەوە بیابانی نەبوونی، تەنانەت ناوی شاعیرەکانیشمان پێ نەگەیشتووە ئەم دەپانزە بیست دیوانەی کە ئێستا لەناومان هەن بەچاپکراوو دەست نووسەوە هەر شاعیری ناوچە خۆمانن لە دوو سەد ساڵ لە مەو پێشەوە، ئینجا ئەبێ شاعیرانی کوردستانی گەورە لەدەوروبەری بابا تاهیری هەمەدانییەوە، کە هەزار ساڵ لەمەو پێش بووین و چەندبووبن و چۆن بووین، ئەمە مەگەر هەر خوا بزانێ . . .

باشه شاعیره کۆنەکانی دەوری بابەتاهیری هەمەدانی ئەگەر فەوتابن لەبەر دووریی ڕۆژگاری، ئەی شاعیرەکانی دەوری خۆمان بۆچی شیعرەکانیان فەوتاون؟!

زۆر دوور نەڕۆین ئەوە شێخ ڕەزای تاڵەبانی کە پێچی مێزەرێکە کۆچی دوایی کردووە، تا ئێستا دووجار دیوانەکەی لە چاپ دراوە بەڵام بەداخەوە لە دەیەکێکی کۆکراوەتەوە؟ ئەوی کۆشکراوەتەوە هەمووی پڕە لە هەڵەو ساتمەو کەم و کوڕی و کورت و کوێری، بێ گومانم شێخ ڕەزا بەقەد (کەلیم) شیعری فارسی وبەقەد نامق کەمال شیعری تورکی و بەقەد نالی و سالم شیعری کوردی وتووە، بەڵام بەداخەوە بەشی زۆریان لەناو چوون و کوا شیعرەکانی بەهەر چوار زبانەکە چییان لێ هات؟ بۆچی مەردێك لە خزمەکانی خۆی شیعرەکانی کۆنە کردۆتەوە؟ یا بۆ خۆی لە دەفتەرێك هەمووی تۆمار نەکردووە؟ دیوانم نەدیوە بەقەد دیوانی شێخ ڕەزا بەدبەخت و وێران بێ و هەڵەی تیابێ . . . !!))

ژ دەسپێکێ هەتا ( ئەی شاعیرەکانی دەوری خۆمان بۆچی شیعرەکانیان فەوتاون) بۆ ژبەرکرنێیە.

# ڕەوشەن بەدرخان

## ( ١٩٠٩ - ١٩٩٢ )

### ( یەکگرتنا گەلێ کورد بدە من ئەزێ کوردستانەك سەربەخۆ بدەم تە )

ڕەوشەن بەدرخان

ڕەوشەن بەدرخان کچا م. صالح بەردخان (مەحمود صالح بەدرخان) ە، هەڤژینا جەلادەت عالی بەدرخانە (جەلادەت عالی بەدرخان و م. سالح بەدرخان ژوان بەدرخانیانن یێن خزمەتا ڕۆشنبیرییا کوردی کری).

ڕەوشەن بەدرخان ١٩٠٩/٧/١١ ل باژێرێ (قیسەری) ل تورکیا ژدایك بوویە، ژیێ وێ گەهشتە دوو سالا خێزانا وێ بۆ ئەستەمبۆلێ هاتە ڤەگوهاستن، ل سالا ١٩١٣ دەمێ بنەمالا بەدرخانیان بۆ گەلەك وەلاتێن ڕۆژهەلاتا ناڤین هاتینە دوور ئێخستن بابێ وێ نەچاربوو مالا خۆ برە (شام)ێ و ل سالا ١٩١٥ بابێ وێ ژ ئەگەرێ نەخۆشییا تیفۆییێ دچیتە بەر دلۆڤانیا خودێ.

خواندنا خۆ یا سەرەتایی ل قوتابخانا (شوعلەت ئەلتەرەقی) یا تورکی دەست پێکر، پشتی سەربازێن تورکی ژ (شام)ێ هاتینە ڤەکێشان و خواندن ل قوتابخانێن سوریێ بوویە ب زمانێن (عەرەبی و ئینگلیزی) خواندنا خۆ، ل (دار ئەلمەعەلیمات)ب داوی ئینایە و ل سالا ١٩٢٥ ل باژێرێ (کەرەك) ل ئوردنێ بوویە فەرمانبەر.

ل سالا ١٩٢٧ جارەکا دی ڕەوشەن بەدرخان ڤەگەڕیایە شامێ و وەك مامۆستایا زمانێ عەرەبی ل قوتابخانا (ئەللائق) دەست ب کارێ خۆ کرییە ب شێوەیەکێ فەرمی (ڕەسمی).

ل سالا ۱۹۲۹ شووی کرییه، بەڵی دڤی شویێ خۆدا یا سەرکەفتی نەبوویە و پاش (۲۰) مەهان هاتییە بەردان و دڤی ماوەی دا کچەك هەبوو بناڤێ (ئەسیمە خانم).

ل سالا ۱۹۳٤ چوویە ناڤ ڕێزێن ئێکەتیا ئافرەتێن سوریێ و ل سالا ۱۹٤٤ نوونەرا ئافرەتێن سوریێ بوویە ل کۆنگرێ جیهانیێ ئافرەتان دا کو ل (قاهیرە) پایتەختێ میسرێ هاتبوو بەستن.

ل سالا ۱۹۳۵ شوو ب میر جەلادەت بەدرخان کرییە وکچەك بناڤێ (سینەم خان)و کوڕەك بناڤێ (جەمشید) ژێ هەبوون و ل سالا ۱۹۵۱ میر جەلادەت چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ.

ل سالا ۱۹۵٦ دگەل (نوری دێرسمی-حەسەن هشیار-حەیدەر حەیدەری -ئوسمان ئەفەندی) کۆمەلا زانست و ڕۆشنبیری ل (حەلەب)ێ پێك ئینایە (دامەزراندییە).

هەتا سالا ۱۹٦٤ێ درێژی ب کارێ خۆ وەك مامۆستا دایە ول سالا ۱۹٦۵ێ هاتییە خانەنشینکرن. ل سالا ۱۹۷۲ێ بەشداری دکۆنگرێ سێیێ یێ ئێکەتیا ئافرەتێن کوردستانێ داکرییە کو ل کوردستانا عیراقێ هاتبوو گرێدان.

هەتا سالا ۱۹۷۲ێ ل شامێ ژیایە پاشان ژیانا خۆ ل (بانیاس) برییە سەر ل سالا ۱۹۹۲ێ چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ هەمان ساڵدا ژلاوەکێ کورد ڕە دبێژیت (کوڕێ من دەمێ ئەم هەین هوون هێشت پێ نەگەهشتبوون ئیرۆ هوون پێ گەهشتنە ئەم سەر دارێ ژیانێ نامێنن، کوڕێ من حەز ژ هەڤ بکن، دگەل هەڤ هاریکاربن، یەك بگرن و ژ هەڤ جودا نەبن، کوڕێ من یەکگرتنا

گەلێ کورد بدە من ئەزێ کوردستانەك سەربەخۆ بدەم تە).

## خزمەتا ڕەوشەن بەدرخان دوارێ ڕۆشنبیری و دۆزا کوردیدا

دگۆڤارا هاوار (١٩٣٢)دا زۆر خزمەتا رۆشنبیری و دۆزا کوردی کرییە. رەوشەن بەدرخان ئێکەمین ئافرەتا کوردە ل گۆڤارا هاوار گۆتارێن خۆ ب زمانێ کوردی (کرمانجی) ئەلفا بێ یا لاتینی نڤیسین و بەلاڤەکرین.

ل سالا ١٩٧١ێ وەك ئەندامەکا فەخری بۆ کۆڕێ زانیاری کورد هاتییە هەلبژارتن و لایێ کۆڕێ زانیاری کورد ڤە هاتییە راسپاردن کو بچیتە ئەستەمبۆل و ژ پەرتوکخانێن وێ ژێدەرو بەلگەنامە و پەرتووکێن چاپکری و دەست نڤیسێن پەیوەندی ب ئەدەب و زمان و مێژوو کەلەپوورێ کوردی ڤە هەی کۆم بکەت و بۆ کۆڕێ زانیاری ب هنێریت، ڕەوشەن بەدرخانێ زۆر سەرکەفتیانە کارێ خۆ جێ بەجێ کر.

ل سالا ١٩٥٧ێ کۆنگرێ ئێکێ یا وەلاتێن دەریا یا سپی و ڕۆژهەلاتا ناڤین دژی کۆلونیالیێ ل ئەسپانیا (یونان) هاتە گرێدان و ڕوشەن بەدرخانێ پشکداری تێداکر کۆ ئێکەمین ئافرەتا کورد بوو بۆ جارا ئێکێ پشکداریێ دکۆنگرێ جیهانێ دادکەت.

ئەڤە پارچە نڤیسینەکا ڕەوشەن بەدرخانە کو دگۆڤارا هاوار ژمارە (٢٧) یا ١٥ی نیسانا ١٩٤١ێ دا بەلاڤبووی ل ژێر ناڤێ (ستوونا کابانیان کابانی و مامۆستە):

(( خوەهێن من ئێن دەلال، هەروەکی هوون ژی دزانن دەردێ مللەتێ مە ئێ مەزن و غەدار نەزانییە، نەزانین نەخوەشییەك و دەرمانێ وێ زانینە. نك مللەتێن خودان حکوومەت و تەشکیلات ڤێ نەخوەشیێ دخستەخانەیێن خسوسی دە دەرمان دکن و ژوان خەستەخانان ڕە (دبستان) دبێژن. مامۆستە پزیشکێن وێ خەستەخانەیێ نە، مللەتێ مە نەخوە دیێ وان خستەخانانە، مللەتێ مە مللەتەکی بێ تەشکیلات، بێ خەوەدی وسەری، مللەتەکی بەلاولایەو دبن حکمێ مللەتێن دوژمن دن، مللەتێن دوژمن دەیە، لێ دوژمنێ مە ئێ مەزن، ئێ مەزنتر نەزانییە. دڤێت ئەم شەڕێ وی دوژمنێ غەدار بکن. دڤی شەڕی دە ژی مە ژنێن کوردمانج ڕە دڤێت کو ئاریکاری مێرێن خوە بکن زارۆیێن خوە بعەلمینن خوەندن و نڤیساندنێ و وان ژ نەخوەشییا نەزانیێ خەلاس بکن))

(ژدەسپێکێ هەتا میللەتێن دوژمن دەیە بۆ ژبەرکرنێیە)

## رامانا پەیڤان:

دبستان : قوتابخانە.

نەخوە دیێ وانە : خودانێ وان نینە.

نڤیساندن : نڤیسین.

زارۆیێن خوە : زارۆکێن خۆ.

هوون ژی : هوین ژی، هنگوش.

# (( بەشێ خواندنێ ))

١- خەج و سیامەند.

٢- تویتن.

٣- مەقام و ئاوازو ئامیرێن موزیکا کوردی.

٤- خەییام.

٥- شیللی.

٦- چوونا سەر هەیڤێ.

٧- پیشەسازی دناڤ کوردەوارییێدا.

٨- تازیا گورانی بۆ پیرەمێردی.

٩- میکرۆبێن دۆست.

١٠- شاعیرێ نەتەوەیی.

١١- گالیلۆ.

١٢- بەرهەمێ زۆر و دابەشکرنا ب هەمیانە.

١٣- کەرکووك.

١٤- گوڵە مێخەك.

## خەج و سیامەند

هەمی داستانێن ئەڤینی یێن کوردی، دگەل بەحسێ ئازادیێ خۆ گوریکرنێدا، وێنەیێ وەفاداریێ و ئاخفتن و پەیمانان برییە سەر، دهەمی داستانەکا دلداریا کوردیدا سۆزا ئەڤینێ و دلداریا ڕۆژ هەلاتی دیاردکەت، دناڤ ڤاناژییدا، دیسان دیمەنێ کێشەیەکێ هەر یێ دیارە، کیشەیا دناڤبەرا باشی و خرابییێ دا، دناڤبەرا پاقژی و نەپاقژییێدا، وەفاداریێ و راستیێ دگەل بێ پیمانییێدا، دڤێرە ژییدا دیسان گیانێ مللەتی دەردکەڤیت وئەڤ دۆزە ب لایەکێ دیڤە دهێتە گرێدان ب وی دۆزا کو ژیانا جڤاکیدا هەی.

لەوا زۆر جاران دێ بینین قەهرەمانێن داستانا ئەڤینی، مرۆڤێ رێنجبەر و زەحمەت کێشە و ب هەمی خەسلەت ونیشانێن ڤان کەساندا ژ رەوشت و کردارو دەرئەنجامیدا، وێنەیێ مەردایەتیێ و ئازایەتیێ و وەفاداریێ و خوگوریکرنێ یا دیارە.

چەند داستانێن کوردی هەنە کو چیرۆکا حەزلێکرنا کوڕێ جوتیارەکی دگەل کچا ئاغایەکی دهێتە گێران، ئەرێ دێ شێین بەحسێ ڤێ ئەڤینیێ بکەین و ئەڤێ بکەینە نموونەیەك بۆ هیڤیێن بەردەوام یێن مرۆڤی هیڤی ب ژیانا باشترو خوشتر گەهشتن هەبیت؟ گەلەك جاران ژی دبیت هەر ئەو کچا ئاغایە دوتمام و کەس و مرۆڤا جوتیاری، وەکی دداستانا خەج و سیامەندیدا دبینین ئەو داستانەیا کو هەر ب تمامی داستانەکا کوردییە و بەشەکە ژ گەنجیینەیا نەتەوەیی مە و دناڤ کوردان‌دا زۆر یا بەلاڤە.

عوبەیدللّایێ ئەیوبیان[1]: دپێشەکییا فارسییا چاپا خەج و سیامەندیدا نڤسییە:

((مێژووی ژیانی خەج و سیامەند دیارنییە. ئەم بێ مێژوویيە بەقسەی یەکێك لە مامۆستایان شتێکی تایبەتی خەڵکی چیایە، بەیتی خەج و سیامەند وێنەی گیان بەخشینە، داستانێکی ڕاستەقینەیە کە لەسەر گوزەشتەی سۆزمەندی سیامەندی قارەمان و ئارەزووی سادە، بەڵام گیان بەخش و لە عەشق و وەفاداری و گیان بەخشینی (خەج)ی فیداکاری وەرگیراوە)).

ل دویڤ وێ پێشەکێی خەج و سیامەند خەلکی گوندێن سەر ب بلنداهێن (چیایێ سیپانێ) ڤەیە ل دەڤەرا مەهابادێ. لێ جۆرێ دی یێ گێڕانا ڤێ چیرۆکێ ب کرمانجی (سیپان) دبەنە لایێ دەریایێ وانێ، ژڤێ داستانێ ئەم دشێین (بیرو هزرا روون و ئاشکرا و دەروونێ زیندی یێ میللی وهونەرێ خەلکێ کوردستانێ بگەهین، ئەڤە داستانەکا عەشق و ئوڤینیێ یە کو هەمبەری وێ کێم داستان هەنە، چونکی ب جۆرە هونەرەکێ بال کێشی هاتییە نڤیسین، جۆرێ هزرکرنا کوڕو کچان ب عەشق و ئەڤینی و خوشەویستییێدا نیشاددەت و دستوورێن خۆدا ئێکە ژوان بەرهەمێن ب دیمەنێن دەروونی و دیمەنێ مەعنەوی یێ ناڤ کوردان.

دڤێ داستانێدا وەکی هەمی داستانێن ئەڤینیێ ل گوپیتکا چیایێن کوردستانێ، وەکی چیرۆکا بن دارو تڕاشان و ئەردان و زبارێن دورینێ و دار کێشانێ . . . .

---

(١) عوبەیدللّا یێ ئەیوبیان ل سالا ١٩٥٦ ل تەورێزێ، داستانا (خەج و سیامەند)ی ب پیتێن لاتینی چاپ کرییە فارسی و پێشەکی بۆ نڤیسییە.

(خەج و سیامەند)[1] حەز ل ئێكو دوو دكەن وپەیمانا ئەڤینیێ و وەفاداریێ دناڤبەرا خۆدا گرێددەن، كەس و كارێن خەجێ ڕازی نابن كچا خۆ بدەنە سیامەندێ هەژار بلا پسمامێ وی ژی بیت، لەورا خەج بریارا وێ چەندێ ددەت ل گەل سیامەندی خۆ بدەتە ڕەڤان سیارێن عەشیرەتا وان ب دویڤ دكەڤن، سیامەند شەڕەكێ دژوارو ئازاد دگەل واندا دكەت، هەتا داوییێ تیرەك سنگێ وی دسمیت و ل سەرێ چیاییێ پڕ بەر و دار گرێل دبیت و دفڕیت و (خەج) ژی خۆ ددیڤدا دهاڤیتە خوار ب رەخ ئەڤینداریێ خوڤە دمریت.

سیامەند ژی بەری بمریت بەرێ خۆ ددەتە خەجێ و دبێژیت:

((سیامەند گاز دەكا: وەی لەمن ... توخوا (خەج)ێ بەسەرو ڕووی سوورەوە، مەكە-هەی -ڕۆ ڕوو گریانێ. میهرو جەمبەری خۆشەویستت لە دڵما تاكو مەرانی ئاورێكی بەردەوامە لە هەناوێ، نە بەر گورەژنی شیبانی نیوە شەوێ دەكوژێتەوە، نە بە پڕیژكا دەبارانێ.

بۆ چڕۆكێكم لەتەنی هەڵدەستی لە گوییێن هەوری ڕەش دەگەڕێتەوە كەلێنی ئاسمانێ)).

---

(١) خەج و سیانەند ب دوو دیالیكتێن مەزنێن كوردی هەیە، ل زۆر دەڤەرێن جودا جودا ل كو ردستانێ ل دویڤ شێوە و زارێ دەڤەر پێ دئاخڤن ئەڤ داستانە یا بەلاڤە. ئەوا هەتا نوكە هاتییە چاپكرن، ئەوا ل بەریڤانێ دكتور حاجی جندی (١٤٨) لاپەراندا ل گەل ناڤەڕۆكیێن دی یێن (نڤیساركاریا كرمانجییا سۆڤیتی - ١٩٥٧) ل ژێر ناڤێ (سیامەند و خەجێ) چاپ كرییە، هەروەسا ئەو چاپا عوبەیدڵلاێ ئەیوبییانی، هەر وەكی محەمەد توفیق وەردی ل دەڤەرا شەقلاوە جورەكێ ڤێ داستانێ نڤیسیە ڤە.

دڤێ داستانێدا هەروەکی بێ ئومێدیێ و کارەساتێ نیشاددەت، دیسان هەتا سەکەراتا مرنێ ژی دەست ژ ئەڤینی و و وەفاداریا خۆ هەلنەگرت و یادیارە، بەری مرنا سیامەندی دبێژیتە خەجێ:

((ئاخ ... ئاخ... ئەمن چ بکەم: نەم ماوە مەودای دەس کردنەوەی، جەنگەی دەخۆر ئانانێ... ئاخ دەستم ناگرێتەوە شینگی گەروماری چرگەی خەنجەری دەبانێ. لەبۆت بگرمەوە سەرو خواری ولاتی کرمانجاتێ و شەش دانگی دە کۆنە مەیدانێ))

خەجێ دەمێ ڤێ دلسۆزیا سیامەندی دبینیت، چارەنڤیسێ خۆ ب وی ڤەگرێددەت دناڤ جەرگێ بێ ئومێدیێ دا بڕیاراخۆ ددەت* و دبیتە وێنەیێ وەفاداریێ وئازایەتیێ، برایێن وێ نێزیکی وی دبن و دبێژن بکوژن سزایێ رەڤینا وێ دگەل سیامەندی، بەلێ ئەو هەوار دکەت:
((جا بەخوا: ئەوانەی دێن، چ هۆمیرو گزیرن، چ کومێل و راسپێرن. چ مێ گەلن، چ نێرن، لێم خۆشن یا زویرن، ناتوانن سیامەندەگیان، تا پشوویەکم مابێ لە تۆم ببوێرن)).

سیامەند ل سەرێ چیایی کەفتە خوارێ، بەری برایێن خەجێ بگەهنێ، خەجێ ژی خوددویڤدا دهاڤیتە خوارێ وبەری بمریت شینبەکێ بو سیامەندی دکەت، کو دگەهیتە وێ شینا زینێ بۆ مەمێ دانای، تمام وەکی ئێکن، هەروەکی شاعیرێ مەزنی ڕووس (لیرمانتۆف) ل داستانا (دایمۆن -دێو) نڤیسییە کو

* سترانبێژێ هونەرمەند (عیسا بەرواری) خودێ لێ رازی (خەج و سیامەند) ب مەقامەکا تایبەت دبێژیت.

دبیت هەرگیانی رۆژهەلات و دەڤەرا قەفقاس ئەو ئیلهامە دابیتێ:

خەجێ دبێژیت:

جا ژیان چییە؟ گیا ن بۆ چییە؟

چۆن بلێین ئەوەتانێ ماوە، خەجی سیامەندییە.

بەخودای، خودای پاکی، بە یەزدانی ڕووناکی

سوێند بەجوانی و چاکی، بە (تۆ) ڕۆلەی ئاوو خاکی

بە خۆشەویستی و جوانی، بە مەرگ و بەژیانی.

بەڕۆژی ئسمانی، بە ئاوە ڕوونەکەی کانی.

بە پیری کامەرانی، لاوۆ هەر تۆم خودانی.

بە چاکی کەسکەوانی، بەسوورە گەنم ونانی.

لە مرنی یا لەمانی، بزانی یا نەزانی.

بەڕاستی و ڕەوانی، سیامەند گیانی گیانی.

لاوۆ هەر تۆم خودانی،

لاوۆ هەر تۆم خودانی.

تا ماووم بەتەماتم... ئەزیش بەدووتدا هاتم!

ئەڤ دوماهیا تراژییدیا مرنا خەج و سیامەندی هیڤی کوشتن نینە ددلیدا، نەسەر شۆڕکرنە بۆ زۆرداریێ، وێنەیێ دیتنا کارەساتێ نینە دژیانێدا، بەلکی هەوارەکە بۆ بزاڤەکێ بەرامبەر وان هەمی رێك و جهێن کارەساتان ساخ دکەنەڤە.

خەجێ بەری مرنا خۆ بەحسێ چەوانیا مرنا خۆ دکەت و دبێژیت:

((ڕاسپێر بێ، منیش لە (زارگەلێ) لە تەنیشت گۆڕی سیامەندە خۆشەویستەکەم، ناکامی جوانە مەرگی بنێژن)).

ئەو چیرۆکە تاڵ و شرینە بەسەرهاتی دوو جەهێڵی ناکامە بگێڕنەوە بۆ منداڵان بۆ کوڕو کچانی دەکرمانجیا تێی بنێژن. ئەو دای و بابانەی کچیان بێ دڵ دەکەن، بەزۆری بەمێردیان دەدەن، تاڵی ئەو هێنگە (ڕاو- ڕاوە) نالەبارەی بچێژن.

دەبلێن، خۆشتر بژێیتەوەو ڕاوەستاوبێ دابی بەرزی خوازبێنی و کچ بەمێردانی کرمانجاتێ بە دڵی کوڕو کچانا (شوێنی دای وبابانە) گەلێ- هێژاو لەمێژن.

چ ژڤێ داستانێ و چ ژ هەمی داستان و داستانێن دی یێن کوردی، ئەنجامەك دەست مەدکەڤیت، ئەو ژی ئەڤەیە کو قەهرەمانێ ئەڤانژی وەکو چیرۆك هەر مرۆڤ ب خۆ بوویە، ئەڤە ژلایەکی ڤە وێ چەندێ نیشامەددەت کو داستان بەرهەمێ پشی ئەفسانێیە د مێژوویا ئەدەبێ کوردیدا و ژلایەکێ دیڤە وی بایەخ وبهایێ مەزن دیاردکەت کو دناڤ مللەتێن دیدا ددەنە مرۆڤی و ژیانا وی، هەر وەسا هەستێ وی یێ دەروونی وب ڕابوون و رۆنشتناوی.

ب دەستکاریڤە ژ پەرتووکا

(ئەدەبی فولکلوری کوردی)

د. عزەدین مستەفا رەسول وەرگێرایە

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

گۆڕ : قەبر -ترب.

پەیمان بردنە گۆڕەوە : هەتا مرنێ پەیمان نەشکاندن.

کێشە : دۆز.

دەسمێ : کۆن دکەت.

میهر : خوشەویستی، بشکورین.

بۆ چرووك : بێنا گۆشتێ سووتی.

شێنگی گەرو مار : تیرا گەرو مار.

ببێژن : فەشێلان.

هێنگ : دەم، چاخ.

## دان وستاندن:

١-تو چ دەربارەی خەج و سیامەندی دزانی؟

٢-ئەوا تە خواندی، پەیوەندی ب وی بەحسێ داستانێڤە چییە کو ل سالێن بۆریدا تە خواندین؟

٣-چ ژ بەراوردییا خەج و سیامەند و شیعرا لێرماتووڤی گەهشتی؟

٤-دڤی بەحسی دا تو گەهشتیی چ ئەنجامەکی؟

٥-نڤیسەرێ پەرتووکێ، بەحسێ (خەج و سیامەند)ی ب وی شێوەی لێکدایە کو تە خواندی، ئەرێ تو دشیێ چیرۆکەکا دی یا ئەڤینی هەر بڤی شێوەی بنڤێسی ولێکبدەی؟

# تویتن

وەلاتێ مە وەلاتێ ب خێرو بێر، بەرو بەرهەمێ هەمی جۆرە چاندنەکێ تێدا دهێتە چاندن و بەرهەم ئینان و هەمی جۆرە دارو بارو تراش تێدا شین دبن، ژوانا کو گەلەك دکەڤندا ل وەلاتێ مە دهێتە پەروەردەکرن و چاندن و مفایێ بازرگانی و ئابووری لێ دهێتە وەرگرتن تویتنە تویتن، سامان و متایەکێ زۆر ب بهایە بۆ وەلاتێ مە و ب هزاران جوتیار و بازرگان و فەرمانبەر ب چاندن و کاروبارێن تویتنێ دمژیلن و ژیانا وان یا پێڤە گرێدایە. بەلێ ئەڤ چەندە هەتا نوکە بشێوەکی کەڤن و دوور ژ رێکێن زانستییە، ئەڤ بەرهەمە یێ پێگەهاندی و چاڤێ خۆ ددایێ. ژ ئەگەرێ پێشەفتنا وەلاتێ مە و هێدی هێدی چاندن و پەروەردەکرنا تویتنێ ب رێکێن زانستی باشتر لێ دهێت، ب تایبەتی دەمێ حکومەتێ رێڤەبەریەکا تایبەت دامەزراندی کو چەند پشك و لقێن بۆ ڤەکرین، ژ بۆ چاڤدێری و پێشئێخستنا چاندن و بەرهەم ئینانا تویتنێ و هەروەسا هاریکاریا جوتیارو فەلاحان، ژوانا کو هەردەم مژویلی ڤی کارینە، ژبەرهندێ ئەم دبینین کو رێڤەبەریا (ئینحسارا تویتنێ) هەردەم یا مژویلی وێ چەندێیە کو بوارێ چاندنا تویتنی و کرین و فرۆتن وبکارئینانا وێ دناڤ وەلاتی دا و بکارئینانا وێ د کارگەها جگاراندا، هەروەسا فروتنا وێ بۆ دەرڤەی وەلاتی بەرەڤ باش دبەت و وەلێ بکەت کو مفایەکێ باش بگەهینیتە هەمیان.

ژبەر هندێ ل وەلاتی مە بتایبەتی ل دەڤەرا کوردستانێدا گەلەك جۆرێن توتنێ دهێنە چاندن و دهێنە پەروەردەکرن و دگەهیتە بەرهەمی، دڤێ دوماهییێدا دەولەتێ و هەرێمێ ژی هەمی ئەو کارخانەو کارگەهێن جگارەیان دروست کرن و توتنا پێدڤی ئێخستیە ژێر دەستێ خۆڤە، ژبلی هندێ کو چەندین کارخانە و کارگەە دامەزراندن وەکو کارخانا جگارەیا سولەیمانییێ.

ژبۆ چاندنا توتنێ گەلەك پێنگاڤ هەنە کو جوتیار و توتنکەر دڤێت باڤێژن ول دویڤ بچن بۆ چاندنەکا باش.

ل دەسپێکا هەیڤا مارتێدا تۆڤ دهێتە چاندن و سەخبێردکەن ژ نەخۆشی و چویچکان دپارێزن، ل دویڤ دەستوورەکێ تایبەت ئاڤ ددەن ل ناڤ حەود و مشاراندا دچینن، پاشی پشتی دگەهیت بەلگان دێ ژێ ڤەکەن و دێ کەنە گلوازە و لسەر داران ددانن هەتا هشك بیت، بۆ ماوەیێ (١٢) ڕوژان دێ لبەر هەتاڤێ دانن، ل دویڤدا دێ ل ژوور و سەباتاندا هەلاویسن، پاشی دێ کەنە دناڤ خەرارو گونییاندا دێ داگرن و ئامادەکەن بۆ فروتنێ، بۆ رێڤەبەریا ئێحسارا توتنێ، توتن ل گەلەك وەلاتێن جیهانێدا دهێتە چاندن و سەخبێرکرن وەکی (تورکیا ، ئیران ، بولگاریا ، ئەمریکا ، ئوستراليا. . . )

## راڤەكرنا پەیڤان:

| | |
|---|---|
| متایەكێ باش | : بەرهەمەكێ باش. |
| كارخانە | : كارگەهـ -مەعمەل. |
| ب رێكێن زانستی | : ب شێوەیەكێ زانستی (علمی). |
| حەود و مشار | : حەود كەرتك. |

## دان و ستاندن:

١-تویتن ل كیژ جهی ل وەلاتێ مە دهێتە چاندن؟

٢-ئەرێ تویتنێ مفایێ بازرگانی و ئابووری هەیە؟

٣-ئەو رێڤەبەریا ب كاروبارێن تویتنێ ڕادبیت چ دبێژنی و چ دكەت.

٤-تویتن ل كیژ هەیڤێ دهێتە چاندن؟

## مقام و ئاوازو ئامیریٚ موٚزیكا كوردی

(( شیعرا مەولەوی ب دەنگیٚ خۆش و هیجرانی (عەزیز ئامینە) ڤەلناف مە دا هاتییە نیاسین و پەیدا بوویە. عەزیز سترانبێژەكی عەزیز بوو، دناف مەجلیساندا هیجرانی بۆ چیان هەر ژ وی دهات، ئەڤە راستە كو سپێدەهییەكیٚ ل بەر نێچیرا كەواندا بەندەك گوت و خواندو كەویٚ چیایان وەلیٚ كر گوهبدەتیٚ و قەب قەبیٚ بكەن.

ئێك دوو هۆزان هەبوون كو ژ دلیٚ وی دەردكەفتن، نەخاسمە ل بهاران ول ئێڤاران و ل سەر ئاڤان دەمیٚ دگوت:

وەهارەن، سەوزەن، ئاوەن، پێكاوەن، یاخوو:

گوڵ چوون ڕووی ئازیز نەزاكـەت پۆشان

وەفراوان چــوون سەیل دیدەی من جۆشان

-یان ژی سپێدەهییان كو ب مقام ڤە دگوت:

لە ورشـــەی شـــەونم، لە توێی پەردەوە

نێرگس مەست مەست چەم بلاوكردەوە،

ئەڤەنە ئەو دەنگیٚ دەسپێكییٚ بهاران و دلپاڤژیا وی دەمیٚ یارانە. ڤێجا ڤان دەنگان لێك بدەین چ سۆزەكا ئەڤینی دئێخستە مێشكی و دەروونی، ئەڤ سوزە هەر مێشكی من دابوو، من دڤییا بسەر یاراندا دابەشبكەم . . .))

پیرەمێردی ب ڤی رەنگی ڕوحا مەولەوی دەست پی دكەت، ب ڤی شێوەی ئەگەریٚ وەرگێرانا هۆزانێن مەولەوی ژ هەورامی بۆ زمانیٚ ئەدەبی بیٚ نوكە روون دكەتەڤە.

بەلێ.. شیعرا مەولەوی کو زوربەیا وی ل سەر کێشا دەهـ پەنجەیی یا کوردی، ب ئاوازێ (قەتار)ڤە دهێتە گوتن، یان بێژین (قەتار) ب شیعرا مەولەوی دهێتە گوتن. . .بەری نوکە ژی قەتار هەر هاتییە گوتن.

زانایێ ناڤدارێ کورد (جەمیل بەندی رۆژبەیانی) دەربارەی ناڤێ سترانا کوردی، بۆچوون و ڕایەك هەیە کو دبێژیت:-

((... ڕەنگە ناوی هەندێ لە گۆرانییەکانی کوردی زۆر کۆن بن، بۆ وێنە (قەتار) ڕەنگە لە وشەی (گاتا)وە گۆڕابێ، و لەکاتی خۆیدا هەر گاتای پێ وترابێ، هەروا (هۆرە)، ڕەنگە گۆرانییەکی تایبەتی بوو بێت بۆ ستایشی (ئاهور مازدا)... هەروەها (کەلهوڕی) ڕەنگە (کەلە ئاهۆڕایی) واتە لە گۆرانییە هەڵبژاردەکانی باسی ئاهوڕا بوو بێت. جگە لەوە گۆرانی (خورشیدی) تا ئێستا گەواهە کە لەکاتی هەڵاتنی خۆردا وتراوە، بەناوی نیازەوە، چونکە دەبینین بەرامبەر بەوە، گۆرانیی (خاوکەر)مان هەیە کە بۆ خەوهێنان وتراوە.

ئەم ڕاوردە، لێکۆڵینەوە و لێ دواندنێکی قووڵی دەوێ، زۆر بەجێیە کە (قەتار) لە گاتای زەردەشتەوە یا لە ئاڤێستاوە هاتبێت، بەڵام دوور نییە (قەتار) هەر لە وشەی (قەتار)ی عەرەبییەوە هاتبێت، کە بەمانای کاروان بەکاردەهێنرێت. بەڵگەش بۆ ئەمە، ئەوەیە کە زۆر جار لە مەقامی قەتاردا گۆرانی بێژ دەڵێت: (قەتارێ بێنن غەمانم بارکەن)، یا بەم مەقامەوە جۆرە هۆنراوێك دەووترێت، کە مانای ڕاستەقینە یا مەجازیی گەشت و ڕۆیشتن و کاروانی تێدا بێت. وەك ئەم دوو فەردەی مەولەوی:

ئـــازیز دیـــارەن وادەی لـــوامەن

ئەلوەدای ئاخر، ئەوە نـــــامامەن

دەوڵەتەکەی وەسڵ پا نەزەواڵەن

جاریوەتەر دیدەن بالات محـــاڵەن

(هۆرە) زۆر بەجێیە کە یەکێك بێت لە گۆرانییە تایبەتییەکانی (ئاهورا مازدا)... یا هیچ نەبێت سەرچاوەکەی یەکێك بێت لە گۆرانییە ئاینییەکان. چونکە دەبینی ئێستاش (هۆرە)، هەر تەنیا هۆرەی دەروێشی لەناو کورددا لەمانە هەموو بەناوبانگترە، و دوور نینە (هۆرەو ئاهووراو هاوار) لە ڕووی وشە یا زمانەوە، لەیەك سەرچاوەوە هاتبن، ئەم وشەو مانایە تەواو لە وشەیەکی زمانێکی تری هیندۆ ئەوروپییەوە نزیکە کە ئەویش وشەی (هووڕا)ی ڕووسیە کە بەمانای هاوار یا بلێین -بانگ یا هوتاف- بەکاردێت و نزیکی ئەو مانا کوردییانەیە.

ڕۆژبەیانی، مەقامی خورشیدی-بە مەقامی کاتی خۆر هەڵاتن دادەنێت، بەڵام مەقام زانی بەناوبانگ عەلی مەردان، ئەم مەقامە بە گۆریانی کاتی خۆرنشین دەزانێت، هەر چۆنێك بێت هەر بەستراوە بە خۆرەوە، جا خۆر هەڵات بێت یا خۆرنشین، ئەگەر لەسەر لێکدانەوەکەی ڕۆژبەیانی بڕۆین و گۆرانی کوردی هەموو بەرینەوە سەر سەرچاوەیەکی ئاینی، ئەوا ئەم مەقامی (خورشیدی) یەش دەبەینەوە سەر سەردەمێکی زۆر کۆن، دەیبەینەوە سەر ئەو کاتە کە ڕۆژ جێگەو مانایەکی تایبەتی لی باوەڕی کورددا هەبووە. بەڵام دەتوانین هەڵهاتن و ئاوابوونی ڕۆژیش بە ئیش کردنەوە ببەستین،

هەروەك دەتوانین (هۆرە)ش بکەین بە هاواری کاتی ئیش کردن. مەقامی (خاوگەر) یش دیسان دەبرێتەوە سەر هەردوو سەرچاوەکەی گۆرانی)[1].

دیارە مەبەست ژ هەردوو ژێدەران ئەوە کو نوکە دناڤ گەلەك میللەتاندا جهێ دان و ستاندنێ یە، ئەرێ ستران ژ ژێدەرەکی ئایینی پەیدابوویە، یان ژ کارکرنێ پەیدابوویە. ئەڤ بەحسە دوێ پەرتووکێدا کو ئەو چەند لاپەرێن لسەری مە ژێ وەرگرتینە هاتینە بەحسکرن ودان و ستاندن لسەر کرییە. بەلێ مەرەما مە لڤێرە ساخکرنا ڤی بەحسی نینە، بەلکو مە ئەڤ چەند لاپەڕەنە وەك بەلگە بۆ کەڤناتیا ستران و موزیکێ لنك کوردان ئینباینە ڤە. دیارە ستران لنك کوردان زۆر یا کەڤنە و میللەتان ب ساناهی ل دەستپێکا دیرۆکا پەیدابوون و دروست بوونا وان ستران پەیدابوویە، بەلێ ئەو موزیك یا ئێخستیە ڤالبەکێ زانستی ورێك وجهێ خۆ هەیە، ئەوژی هەر یا کەڤنە و د ژێدەرێن دیروکێدا گەلەك بەلگە بۆ پەیوەندییا کوردان و موزیکی دبینین.

بەدرەدینێ هەولێری کو ل سالا ٦٨٦ی مشەختی-١٢٨٧ی زاینی هاتیە سەر دونیایێ ول سالا ٧٢٩ی مشەختی ١٣٢٨یزاییني پەرتووکا (ارجوزە الانغام) یا نڤیسی.

(١) ئەو ئاخفتنێن دناڤ دوو کڤانێن مەزندا ژ پەرتووکا (ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی) هاتییە وەرگرتن.

عومەرێ خدرێ جەعفەر زادەیێ کوردێ داسنی کو ب جەمالەدینێ داسنی ناڤداربوو، ل سالا ٨٠٠ی مشەختی ١٣٩٧ی زایینی چوویە بەر دلوڤانیا خودێ. گەلەك پەرتووك هەنە ئێك ژوانا پەرتووکا (الکنز المطلوب في علم الدوائر والضرب)، کو ل سەر مۆزیکییێ.

مەسعوودی ل پەرتووکا (مروج الذهب)دا دبێژیت: (شوانی کورد شتێکییان داهێنا، کە فووی پێدا دەکرا مێگەلی بلاوی کۆ دەکردەوە).

ژ سیاحەتنامەیا گەڕۆکێ تورك (ئەولیا چەلەبی و مێژوو نڤیسێ کورد شەرەفخانێ بەدلیسی) گەلەك تشت دەربارەی مقام و ئاوازا کوردی تومارکرییە، ئەگەر تەماشەی دیوانا هەر شاعیرەکێ کەڤنێ کورد ژی بکەین دێ بینین کو ب ئاخفتن و سالوخەتڤە بەحسێ گەلەك مەقام و ئاوازا دکەت و ناڤێ گەلەك ئامیرێن موزیکی دئینن ودیارە کو دناڤ کوردان‌دا هەبوون. ئەحمەدێ خانی ناڤێ نێزیکی (٥٥) مەقامان تومارکرییە وەکی شارەزایەکێ موزیکێ مەقام وئاوازێن ئێك دوو جوداکرین، هندەك ڕاو بۆچوون دەربارەی گونجانا مەقامێ و ئاوازێ تێکدا دەربڕینە. هەروەکی پەیوەندییا هندەك مەقامان دگەل هندەك ئامیرێن تایبەتدا دەردئێخیت. وەکی وێ مقاما (گوردان یان کوردان) ب ئامیرێ نایێ دهێتە لێدان و هەروەسا ئەحمەدێ خانی ناڤێ بیست ئامیرێن مۆزیکێ بەحسکرینە و دبەحسێ مۆزیکڤانان‌دا چەند سترانبێژ و موزیك ژەن ژ ئێك دوو جودا دکرنەڤە، وەکی: رامشگەر و خۆش نەواو موتریب و قەوال و غەزەل خوان و گۆیندە. . . هتد هەروەکی خانی پەیوەندییا ستران و موزیکێ دگەل داوەت و شەهیانێن کوردان‌دا ژبیرنەچووینە، ل دەف شاعیرێن دی ژی تشتەك ژڤان بەحس و ناڤان

دووباره دبنه ڤه، تنێ مستەفا بەگێ کوردی ناڤێ سترانبێژێن دەوروبەرێن خۆ و شارەزاییا هەر ئێکی ژوانا د مەقامەکێدا تۆماردکەت، دیارە پیرەمێردو گەلەك شاعیرێن دی ژی هەر چاڤ ل وان کرییە. مەقام و ئاوازا کوردی دگەل دەنگێ شیعرا کوردیدا تێکەل بوویە و شاعیری چ جاران خۆ ژ وێ ئاوازێ جودا نەکرییە.

بەحسێ مەقام و ئاوازو ئامیرێ موزیکا کوردی، گەلەك ڤەکۆلینێن زانستی دڤێت و هەتا نوکە چەند بەحسەك هەنە کو بزاڤا وان ڤەکولینان تێدا بەحس کربیت، ئەڤێ ژی جهەکێ دی دڤێت بۆ بەحسکرنێ، ڕەنگە باشترین ئاخفتن بۆ سەلماندنا ڤی بەحسی و بۆ ب دوماهیئینانێ چەند دێرەك بن کو (گۆران)ی هۆزانا (دەروێش عەبدوڵلا)ی پێ ب دوماهی دئینیت.... بەرێ خۆ ددەتە دودکا دودك ژەنێ پیرێ هونەرمەند و دبێژیت:

ئەوەنـــدەم بیست لە مۆسیقـــا، خـــرۆشی ڕۆحی بێگانە
میزاجی کـــوردەواریم تێک چـــووە دەروێش عەبدوڵلا،
دەخیلیت بم! دەســـا بەو لاووک و ئای ئای و حـــەیرانە
شـــەپۆلی زەوقی میللی پڕ دەروونی مـــات و چۆڵم کە
لە بیتهۆڤن گـــەلی زیـــاتر، بـــەڕۆحم ئاشنای، وەڵلا،
دە ئەی دەروێش سکالایەک لە گەڵ ڕۆحی کڵۆڵم کە.

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

| | |
|---|---|
| وەهاران | : بەهارە |
| سەوزە | : سەوزی، کەسکاتی |
| شەونم | : خوناڤ |
| چۆن سەیل | : وەك سەیل، مینا سیلاب |
| چەم | : چاڤ |
| گاتا | : دوعان ناڤ (ئاڤێستا) یا زەرەدەشتی |
| گەواهـ | : شاهد |
| لوامەن | : چەوا ئەز چویمە |
| ئەلوەدا | : خاتر خواستن (الوداع) |
| ئەوەنامامەن | : چوون و نەچوون |
| پا ئەزەواڵەن | : بێ ئینایە نەبوونێ |
| جارێوەتەر | : جارەکادی |
| دیدەن | : دیتن |
| ئاهورامازدا | : خودایێ باشێ زەردەشتی |
| میللەتان ئاسایی | : وەکی میللەتان |
| سەلماندن | : ئیسبات |
| خرۆش | : جۆش، بیرو هزر |

## دان و ستاندن:

١-چ تشتی (مەولەوی) لنك پیرەمێردی خوشتڤی کر؟

٢-چ دڤێ دگەهی: کو ستران ژ ژێدەری کارکرنێ ڤە هاتیە ژ ژێدەرێ ئایینی نەهاتیە؟ ژ مامۆستایێ خۆ بپرسە.

٣-دپەرتووکخانەیا خۆدا ل دویڤ ژێدەرەکی بگەڕین و ناڤێ چەند مەقامێن کوردی و ئامیرێن موزیکا کوردی تومار بکە.

٤-ژوان کەسێن ناڤێن وان دناڤبەحسیدا هاتین، کی دی پتر بەحسێ موزیکا کوردی کرییە؟

٥-شارەزا دبێژین:

((دڤێت موزیکا هەمی نەتەوە و وەلاتان بەرەڤ پێشڤەبچیت. بەلێ ژبەر بنیاتی کەڤن و مۆزیکا کلاسیکی یا نەتەوەی)).

تو چ دڤی بەحسی دگەهی؟.

# خەییام

دناڤ میللەتێن ڤێ دەڤەرێدا ئانکو دەڤەرا ڕۆژهەلاتا ناڤەڕاست گەلەك زانا و بلیمەت و هۆزانڤان و مێژوو نڤیس و بیرکاریناس و ستێرەنیاس و نوژدارێن مەزن تێدا دیارو پەیدابووینە، کو هەتا هەتایێ دناڤ لاپەڕێن دیرۆکا مرۆڤیدا ناڤێ وان ئاشکرایە و وەکی ستێرا گەشا بەرێ سپێدێ ل ئەسمانێ هونەرو ئەدەبیات و زانستیدا دبرسقن وەکی (ئەبو عەلی سینا و موتەنەبی و حافزو کندی و فارابی و ئیبن ل ئەسیر و سیبەوەی و خەوارزمی و ئەبو حەیان . . .)

خەییام ئێکە ژ وان ستێرێن گەشتێن ئەسمانێ زانست و ئەدەبی، خەییام ناڤێ وی (ئەبولفەتح عومەر کوڕێ ئیبراهیم لخییام نیشابووری)یە وئێکە ژ زانا و بیرکاریناس و شاعیرێن مەزنێن ئیرانێ یێ سەدێ پێنجێ و دەسپێکا سەدێ شەشێ مشەختی. خەییام هەڤچەرخێ سولتانێ سەلجووقی بوو خەییام چونکی شارەزاو پسپۆر بوو، سالژمێرا خورشیدی رێك خستییە. خەییام ب زمانێ عەرەبی و فارسی بەرهەم هەنە، ژ بەرهەمێن خەییامی یێن ناڤدار ب زمانێ عەرەبی چەند نامەیەك ژ (تەبیعیات و میعراج) هەر وەسا نامەیەکا هەی د (جەبرو مقابلە)د اکو ل سالا ١٨٥١ز ل فەڕەنسا چاپ کرییە. ژبلی ڤانا خەییام شاعیرەکێ خودان شیان وب سەلیقە بوویە و چوارینێن وی ل هەمی جیهانێ دەنگ ڤەدانە، ب هەمی زمانێن زیندی یێن

جیهانێ نڤیسینە، خەییامی د چوارینێن خۆدا بیرو باوەڕێن فەلسەفی و تیبینێن حەکیمانە یێن خۆ ب شێوەیەکی سادە و ساناهی تێدا گونجاندینە، چوارینێن وی ب عەرەبی ژلایێ گەلەك هۆزانڤان و زانایێن عەرەبڤە کرینە عەرەبی وەکی (ئەحمەد صافی نەجەفی، ئەحمەد رامی...)

هەروەسا ژلایێ مامۆستا (سەلام و گۆران) گەلەك زانا و هۆزانڤانێن دی یێن کوردڤە کرینە کوردی، ئەڤە ژی دوو چوارینێن خەییامینە کو خودێ ژێ رازی شێخ سەلامی کرینە کوردی:

(١)

بەر لەمن تۆ شەوو ڕۆژێ بوو

چەرخی جەفاکار ئەهات و ئەچوو

بۆ سەر ئەم خاکە پێ بە ئەسپایی

دانێ، چاوەکەم! چاوی یارێ بوو

(٢)

ئەوەی لەدنیا لەتێ نانی بوو

کەلاوە کۆنی ئاشیانی بوو

پیاوی کەس نەبێ کەس پیاوی نەبێ

هەر ئەو ژیاوە، ئەو ژیانی بوو.

★ ★ ★

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

| | |
|---|---|
| ستێرەناس | : ستێرە شوناس (فلکی) |
| پسپۆر | : شارەزا و لێ هاتی (متخصص) |
| چوارین | : چوار خشتەکی (رباعیات) |
| چەرخ | : فەلەك |
| ئاشیان | : خانی، هێلین (جهێ ژیانێ) |

## دان و ستاندن:

١-خەییام ب چ یێ بناڤ و دەنگە؟

٢-ل کیژ سەدەی خەییام ژیایە؟

٣-خەییامی بیرو باوەڕێن فەلسەفی یێن خۆ ژ کیڤە دەربڕینە؟

٤- ناڤێ چەند هۆزانڤان و نڤیسەرێن کورد بێژە کو چوارینێن خەییامی کرینە کوردی.

# شيللى

ئەڤ ئەردێ ئەم ل سەر دژین، باب و باپیرێن مە ژی ل سەر ژیاینە و هاتینە و چووینە، گەلەك زەلامێن مەزن و ناڤدار و زانا و ڤارەمان پەروردە کرینە، کو هەتا هەتایێ ناڤێ وان وەك ستێرەکا گەشا سحاریان ل ئەسمانێ عیلم و زانست و هونەرو شیعرو ئەدبیاتدا دیارە. یا هەژی گوتنێ ئەوە کو مەرەما ڤان جۆرێ زەلامان خۆشی و کامەرانی و پێشکەفتنا مرۆڤان بوو، ب ئێك چاڤ سەحا هەمی گەل و مللەتان دکر.

شاعیرێ بناڤ و دەنگ (شیللی) ئێکە ژ وان زەلامان کو هەتا هەتایێ شیعرێن وی وەك ئاواز و دەنگێ بلبلێ سحاریان ل باغچێ شیعرو ئەدەبیاتدا دەنگ ڤەددەت.

(شیللی) ناڤێ وی (پرسی بایش)ە، شاعیرێ بناڤ و دەنگێ ئنگلیزە. ل سالا ١٧٩٢ ژدایك بوویە ول سالا ١٨٢٢مریە.

شیللی ئێکە ژ شاعیرێن ناڤدارێن (قوتابخانا رۆمانسی) د شیعرێدا، ئەڤی شاعیرێ مەزن ل (ئۆکسفۆرد) خواندییە و گەهشتییە پلەیەکا بلند دزانیاری و شاعیریێدا. ل سالا ١٨٢١ چوویە ئیتالیا، شیللی وەك هەمی شاعیرو و زانا و رەوشەنبیرێن سەردەمێ خۆ، هەست ب ئێش و ئازارێن مرۆڤ و مرۆڤایەتیێ کرییە و ژهەمیان پتر داخوازا سەربەستی و ئازادیا مرۆڤی کرییە، شیللی خودان هزرەکا بەرفرەها وەسا بوویە، دەمێ دگوت (دەرمانێ خرابی و نەخۆشیێن دنیایێ، ئازادی و ڤیانە).

ژ بەرهەمێن بناڤ و دەنگ یێن شیللی قەسیدا (ئۆدۆنیس)ە کو ب مرنا هەڤالێ خۆ (کیتس) ی گوتییە، هەروەسا (بەستەك بۆ شەماڵ) و (بۆ باڵندە). ژبلی ئەڤانە شانۆگەریا (پرومیپوس)ا ئازادی کو پێکهاتییە ژ درامایەکا سترانێ ژ چوار پەردا

ئەڤەژی نموونەکە ژ چەند هۆزانێن وی کو ب دەستکاری بۆ زمانێ کوردی هـــــاتـــــینە وەرگێـــــران.

بلبلـــەکـــان بـــە خەبـــەرن
بلبلـــەکـــان بە خـــەبـــەرن
لە ســـەر لـــق و پۆپی گـــوڵن
ســـەرخـــۆش خانـــە بـــەدەرن
ئـــەوانـــەی ئـــارەزووی ژیـــان
شـــەوق و خۆشـــی لە دڵ نەمـــان
یەکـــی خستـــوون بە خەبـــەرن
بێ هێـــزو تیـــن بە خەبـــەرن
لـــەوێدا بلبـــلێـــکی جـــووان
ئـــاوازو بـــەستـــە بـــۆ ژیـــان
دەلـــێ بە جـــۆش نـــەرم و نیـــان
مـــاندووی دەستی خۆشـی و غەمـــان
کـــەوتە خوارێ ســـەرەو نوگـــوون
لاوە لاوە چـــڕە بـــەرزەکـــە
بـــاوەشی بـــۆ گـــرتۆتـــەوە
هەتـــا هەتـــایە بەرەو نەمـــان!

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

ڕۆمانسی : ڕۆمانتیکی

سحار : سپێدە، زۆی

دەرمان : چارە

شەماڵ : کزە با، بایێ هین

باڵندە : تەیر

## دان و ستاندن:

١-شیللی ب چ بناڤ و دەنگە؟

٢-شیللی ل کیرێ ژ دایك بوویە و دچ ساڵدا؟

٣-شیللی چ د دانا بو چارەکرنا خرابی و نەخۆشیێن دنیایێ؟

٤- ژ شاعیرێن کورد، کیژ شاعیرە (شیللی) و چەند شاعیرەکێن ئەوروپا کارلێکرییە؟

## چوونا سەر هەیڤێ

**هەیڤ:** ئەو هەیڤە کو پێشەنگا کاروانێ جواناسان بوو، بەلکی کتە جوانی و جوانیەك بوو. بۆ هەمی هۆزانڤانان و ئەڤینداران د سەردەمێ بەرێ دا، بۆ هندێ دا ڕوویێ جوانێ دلبەرێن خۆ وەك هەڤی وێ بکەن!

هەیڤ هەر ئەڤە بوو، هەر ئەو بوو، کو د شەڤا چواردێ دا ب ڕووناهیا خۆ ڤێ دونیا مە ڕوون بکەت!.

بەلێ! هەر ئەڤەبوو و ئەو ژی بوو کو دگوتن ئێکە ژ وان هەسارا یێ کو ل دۆر ڕۆژێ دزڤریت و ڕووناهیا خۆ ژێ وەردگریت. . . ب گەلەك سەدەیا و ب گەلەك چەرخا ئەڤە بوو بیرو باوەڕێ مرۆڤی بەرانبەر هەیڤێ. لێ سەدێ بیستێ خەتیرەك ب دەستێ گرت و دەست ب شانازیێ کر ژ هەمی سەدەیێن بۆری دا، گوت: دناڤ من دا مرۆڤی هزرا فڕینێ ژ خوارێ بۆ سەرێ پەیدا کرو دگەل وی ئەم ڕێکەفتین! . . .

ئەڤە و ژوی لای ڤە بیرو باوەڕێ مرۆڤی بەرانبەری هەیڤێ ب سەدێ بیستێ دیت یا خۆ درێژ کری و پەردا دەمێ بۆری هەمی دا لایەکی خۆ گەهاندە هەیڤێ، ژ ئەردی خۆ هەلاڤێت و لسەر بانێ هەیڤێ خۆ گرت!.

بەلێ! مرۆڤی سەدێ بیستێ کارەساتەکا حێبەتێی پەیداکرو هەمی دونیا حێبەتی کر، چونکو گەهشتنە هەیڤێ و دەنگێ ئەردو هەیڤێ گەهاندنە ئێك! . .

ئەرێ وەللا ئەڤە ڕاست بوو، چونکو ل سالا (١٩٧٠)ێ ئێکەمین مرۆڤی (ئارمسترونگ) یێ ئەمریکی هەردوو پێت خۆ دانانە سەر بانێ هەیڤێ و

نیشا هەیڤێ د اکو مرۆڤی لسەر ڕوییێ ئەردی دشێت پێ خۆ پاڤێتە هەر جهەکی و ژئاشوبێ بگەتە ڕاستییێ!!

ل سالا (١٩٧٠)ێ (ئارمسترونگ)ی ب هزاران هزار میلێن ڤێ ڤالاییی یا دناڤبەرا ئەردی و هەیڤێدا بڕین و گەهشتە هەیڤێ. ژ ئەنجامێ وێ چوونا وی بۆ هەمی مرۆڤا دیاربوو کو ئەو هەیڤا هەتا وی سەردەمی مرۆڤی ب جوانەکا ڕویت و د دانا وەسا نەبوو. بەلکی هەیڤ بوو کو پەیکەرەکێ هەرە مەزنی وەکی ئەردییە وب ڕاست و دروستی ڕوون بوو کو ئەو ژی بارستەیەکە وەکی ئەردی و وەکی بارستەیێن دی . . ژڤی ئەنجامی ئەو چەند خویا بوو کو زانست و پێزانینێن مرۆی گەهشتنە جهەکی کو ب وان پێزانینا بشێت بگەهتە گەلەك بارستایێن ئاسمانی و پەردا ئاشۆپێ داقوتیت و خو پاڤێژیت و بچیتە دناڤ جیهانەکا ڕاستی و کە تواریدا. ژڤی ئەنجامی دیار بوو کو د سەدێ بیستێ دا بیرو باوەڕو پێزانینێن مرۆڤێ گەهشتنە جهەکی کو نەبتنێ نە پەنێین قولاچ و کوژیێن ئەردی ئاشکەراکەت، بەلکی دەستێ خۆ درێژ بکەت و بچیت نەپەنێین ئەردی ئاشکەراکەت، بەلکی دەستێ خۆ درێژ بکەت و بچیت نەپەنێین ڤێ ڤالایا دناڤبەرا ئەردو ئاسمانی ژی ئاشکەراکەت هەر ئەڤ حەزە بوو کو نەهێلا سەدێ بیستێ ب سەرڤە بچیت وبلەز خۆ کرە دیاری بۆ هەیڤێ و پارچێن ڕوویێ هەیڤێ ژی ئینانە سەر ئەردی! .

چوونا سەر بانێ هەیڤێ ژلایێ مرۆڤ ب ئەگەرێ هزرو بیرێن خۆشیا ژ دونیایەکێ بکەفتە دناڤ دونیایەکا دی و بەلکی زانستێ سەر ئەردی گەهاندە ئەسمانێ و هەیڤ ژی ئاسمانێ ئینایە سەر ئەردی! ب ڤێ

چوونا سەر هەیڤێ نەخشێ هەمی رابوریێ دیرۆکی گوهۆڕی و دونیایەکا پێزانینێن دی بدەست خۆڤە ئینا بۆ هندێ دا بچیتە جهێن دی یێن ڤێ دونیایا رووبەر درێژ!

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

هۆزانڤان : هۆنەر.

وەك هەڤی : لێکچوون.

دزڤریت : دەسوڕێت.

خەتیره : مەشخەڵ.

خۆهەلاڤێت : باز دا.

حێبەتێی : سەرسوڕمانی.

ئاشۆپ : ئەندێشه.

ڤالایی : بۆشایی.

خویا بوو : دەرکەوت، دیاربوو.

پێزانین : زانیاری.

داقوتیت : بتەکێنێت.

کەتواری : واقعی.

بێنێ : تەنیا.

نەپەنی : نهێنی.

قولاچ و کوژی : کەلێن قوژین.

# پیشەسازی دناڤ کوردەوارییێدا

پیشەسازی ب شێوەیەکێ دەسپێکێ و ب ساناهی، بۆ بدەستڤەئینانا وان تشتا بوو ئەوێن مرۆڤی پێدڤی پێ هەمی، دکەڤندا چاندن و بەرتیژکرن ژلایێ مرۆڤێ کەڤن بۆ راڤ و نێچیرێ، رەنگەکێ پیشەسازیێ بوو بۆ دەمێ خۆ.

ئەڤە راستە، کو شۆرەشا پیشەسازی ل ئەورپا بزاڤەکا نوی بوو، داهێنانا ئامیران و، هێزا لڤینەر، ژبەرهەمێن ڤێ شۆڕەشێنە.

بەلێ دگەل هندێ ژی پیشەسازیا نەتەوەیی هەر ل ناڤەندی بوویە. ئەڤجا ئەم ل ڤی دەمی بەحسێ داهێنانا هێزا هەڵمێ و پەیدابوونا هندەك بیردۆزێن فیزیا وی و داهێنانا کیمیایێ ناکەین. چونکو ئەڤان پەیوەندی ب پیشەسازیا گشتیڤە هەیە، کو ل وەختێ خو ل ئەوروپا کەفتە ناڤەندا ونێزیك بوو هەمی جیهانێ ڤەگریت. مەرەما مە پیشەسازیا نەتەوایەتیا کوردییە.

کوردا هەر ژکەڤن وەرە، هەمی کەل و پەلەکێ کو بو چێکرنا خوارنا وبەرهەم هێنانا چاندنێ دهاتنە بکارئینان، وی ب خۆ چێکرینە، وەك، دیز و گوزك و مەنجەل و قازان و ترار و کەڤچك و تەنوور و مەحفیر و بەڕك و خانك و تیرۆك و گەلەك تشتێن دی، ئەڤە دڤێت گەلەك دکەڤن بن، چونکو ژ پێدڤیێن ژیانێنە، ژبلی ئەڤانا داس و گێسن و هەڤجار و شالۆك و بڤر و هەمی کەل و پەلێن دی کو پەیوەندی ب چاندنێڤە هەیە، هۆستایێ کویرهێ وی ب خۆ چێکرینە.

دناڤ کورداندا دەست کردێ هونەریێ هویر گەلەك یێ پێشکەفتی بوو. ژوانە تەحتی و شەملك کو ناڤ و دەنگێ خۆ هەبوون، هەتا نوکە ل بازاری هەیە.

هندەك دەڤەرێن دی یێن کوردستانێ ناڤ و دەنگێ خۆ هەبوون دچێکرنا چەقۆك وکێر و قەلەمبڕ (کێرکا بچوویك)، ب تایبەت ئەو قەلەمبڕێن بژارە ئەوێن دەستکێن وان ژ هەستی یان شاخێ گیانەوەرا دهاتنە چێکرن. بەلێ هەکە بێینە سەر بەحسێ خەنجەرا کوردی، ئەڤە نەتنێ ژلایێ پیشەسازێڤە بڤارە و جوانە، بەلکی ژلایێ ساخلەتێڤە شیوەیەکێ تایبەتی هەیە، ئانکو خەنجەرا کوردی وەك وان خەنجەرا نینە ئەوێن دناڤ مللەتێن دیدا بەربەلاڤ، باشترین خەنجەرا کوردی ئەوە یا کو دبێژنێ (دەبانی)، میرو مەزنێن کوردا خەنجەرێن وەسا هەنە وگەلەك ب بەهانە، ب تایبەت ئەوا دەستکێ وێ ژ شاخێ سپی دهێتە چێکرن و کاڤلانێ وێ ب زێرو زیڤ و دڕو یاقووتی دهێتە نەخشاندن. خەنجەر ئێکە ژ دروشمێن نەتەوەیا کورد، ژبەر وێ چەندێ دهێتە پێشکیش کرن وەك دیاری، پیلێ پۆستێ حکومەتا کوردستانا خوارێ ل دەڤەرا سلێمانیێ ب سەرۆکایەتیا شێخ مەحموودی وێنەیێ خەنجەرا کوردی ل سەر هاتبوو چێکرن، کورد دبێژنە خەنجەرێ ژی (تیخ) وگوتنا مەزنان دبێژیت:

(( تیخ هەڤالێ زەلامییە))

جغسی ل دەڤەرێن جودا ل کوردستانێ یا پێشکەفتی بوو، ب تایبەتی هوستایێن سلێمانیێ ل سەردەمێ حاکمداریا بابانیان. ل سەدێ هەژدێ و نوزدێ هەمی جۆرێن شیرو تیرو تڤەنگ چێدکرن، بەلێ بناڤ ودەنگترین و مەزنترین کارگەها چەکی ئەوبوو کو ل ڕەواندزێ ل سەردەمێ حاکمداریا پاشایێ کۆرە هاتییە دامەزراندن

ئەڤێ کارگەهێ تنێ چەکێ سڤك چێدکر، بەلکی چەکێ گران ژی وەك (تۆپ) ژی چێدکر، ئەو تۆپێن هەتا نۆکە ل مۆزەخانا هاتینە پاراستن نیشانا ێشکەفتنا ڤێ پیشەسازییێنە ل کوردستانێ. بۆ ڤێ ئارمانجێ حەمە پاشایێ کۆرە هوستا رەجەبێ کوردییێ رەواندزی بۆ فێربوونا ڤێ پیشەسازییێ هنارتە ئەوروپا. دەمەکی مال وێرێ، پاشی ل سالا (١٨١٥) کارگەها شیرو خەنجەرو تڤەنگ و لویلیا توپێ وفیشەك و زێرەنگری و دارتاشی دامەزراند. ئەوا پێدڤی ل ڤیرە بهێتە گوتن ئەوە کو پارە و زێرو زیڤێ میرگەها سۆران کو بناڤێ میر مەنسوور حەمە پاشایێ مەزن بوو، هەر ل وێ کارگەهێ دهاتە چێکرن.

ل هەمی باژێرێن کوردستانێ، سابوون بۆ باژێرو و گوندا بەرهەمەکێ دەڤەرێ بوو، ل مالا دهاتە چێکرن، ئەو بنەمالێن کارگەها سابوونێ لی مالا وان هەبوو، دگوتنێ سابوونچی، ل سلێمانیێ تاخێ سابوونکەران هەیە.. ئەڤ تاخە چییە؟ هەر دگەل ئاڤەدانکرنا باژێرێ سلێمانیێ، پاشایێن بابان پویتەکێ مەزن د داچێکرنا سابوونێ، ئەو بوو سابوونچی هەمی

ل تاخەکی خرڤەبوون و ناڤێ تاخێ خۆ کرە (سابوونکەران) ئەڤ ناڤە هەتا نۆکە مایە.

بەرهەمێ سابوونێ یێ وان مالان نەتنێ بو باژێرێ سلێمانییێ و دەڤەرا سلێمانییێ بوو، بەلکی بو گەلەك دەڤەرێن کوردستانێ و دەرڤەی کوردستانێ ژی دچوو، بازرگانان بەرهەمێ ڤان مالان دکڕی ول خانەیاندا کۆم دکرن، پاشی ب کاروان دا بو بەغداو مویسل و حەلەب و دیاربەکر و تەورێز هێتە هنارتن، هەر وان کاروانا ل ڤەگەریانێ پەرتالێن بازرگانی و گولاڤ و شەکر و چا باردکرن و دهاتنە ڤە.

مووتاوی یان (مووتایچی) ئێکە ژ پیشەیێن بناڤ و دەنگ ل کوردستانێ. دکەڤندا ئەڤ پیشەسازییە ل باژێرێن سلێمانییێ و کۆیە و کەرکووك و هەمەدان و سنە یا بەلاڤەبوو. بەرهەمێ مووتایچی پێکهاتبوو ژ خەرارێ بۆ تووتن و کایی و جهالی بۆ دەخل و دانی.

مەزنترین کارگەها ڤێ پیشەسازیێ ل سلێمانییێ بوو، کو هەمی دەما پازدە هەتا بیست کرێکار کارتێدا دکر. ژنکا ژی ل مالاّن ب تەشیێ هڕی بۆ ڤان کارگەهان دڕست.

ل سەردەمێ نوکەدا نە کوردو نە نەتەوەیێن دی پێدڤی هندێ نینن کو سابوونێ ل سەر شێوەیێ کەڤن چێکەن. بەلێ ل چاخێ ئەلکترون و ئەتۆم و چوونە سەر هەیڤێ و ستێران، دڤێت.

پیشەسازیا کەڤن یا نەتەوایەتی وەك چێکرنا مەحفیر و شەملك و قەلەمبڕ و شەل و شەپك و کلاش و کەڤچکێن داری هەر بمینیت.

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

پیشەسازی : سەنعەتکاری.

دیز : گوزکەکێ مەزنێ درگنی یە.

مەنجەل : ژ قازانێ مەزنترە بو کەلاندنا دەخل و دانی دهێتە بکارئینان.

تیرۆك : دارەکێ زراڤ و حولییە نانی پێ دپێژن.

گێسن : ئامیرێ کێلانا ئەردی یە.

شالۆك : ئامیرەکە بو گیا دورینێ.

تەحتی : بو رائێخستنێ دناڤ مالێدا ژ هریێ دهێتە چێکرن.

قەلەمبڕ : کێرکا بچویکە ئەوا دکەنە د بەرویکێدا.

دەبان : جۆرەکێ تایبەتە ژ پیلای خەنجرو و شیر ژی دهێنە چێکرن.

دڕ : لۆلۆ

جغسی : ئەو کەسێ چەکی چێدکەت، تڤەنگساز.

مۆزەخانە : مەتحەف.

مووتاپچی : ئەو کەسێ خرار و جوهال و وەریسا چێدکەت.

خەرار : تویرکەکێ مەزنە ژ موویێ بزنا فر دهێتە چێکرن.

جوهال : تویرکەکێ مەزنە ژ موویێ بزنا موکم دهێتە چێکرن.

## دان و ستاندن:

١-تو چ دی ژ پیشەسازیێن دناڤ کوردەوارییێدا دزانی بۆ مە بێژە؟

٢-چ جیاوازی هەیە دناڤبەرا پیشەسازی گشتی و پیشەسازی خۆمالی؟

٣-ئامیرێن جووتی ژ گەلەك ئامیران پێکهاتییە، ئەری تو دشێی ناڤێن وان بێژی؟

٤-چ لدۆر هوستا رەجەبێ رەواندزی دزانی؟

دوانەیا بهێتدا بو مە نڤیسینەکێ ب دوو بەرپەرا لدۆر وێ چەندێ بنڤیسە؟

٥-دوو مالکێن شیعرا بێژە کو پەیڤا (خەنجەر) تێدابیت؟

٦-بەراوردیا چێکرنا سابوونێ بکە ل نوکە و دکەڤندا؟

## میکرۆبێن دۆست

دیاره هەر ژ دەسپێکی دێ حێبەتی بی ژ ڤێ ئاخفتنێ و دێ بێژی مە هەر میکرۆب ب دوژمن گولێ بوویە. ئەڤ میکرۆبێن دۆست چنە و ژ کیڤە پەیدا بووینە. ڕاستە ناڤێ میکرۆبی ب خرابی چوویە و هەر دگەل ناڤ ئینانا وی ئێکسەر نەخۆشی دهێنە بیرامە. بەلێ هەر چەندە جۆرەکێ میکرۆبا دخرابن و دبنە ئەگەرێ نەخۆشییێن کوژەك و ترسناك. بەلێ جۆرەکێ دی یێ میکرۆبا نەخۆشی لاوازو بێچارە دکەن. ئەم دەمێ ناڤێ میکرۆبا دئینین دەمل دەست کۆلێرە، ئێشا زراڤ، تایا گران، یان نەخۆشییێن دی ژ ڤی بابەتی دهێنە بیرامە. ئێدی ئەو ناهێتە بیرامە کو میکرۆب یێ هەی هاریکاریا گڤێرینێ دەکەت. یان میکرۆب یێ هەی بارستێ خوازێ دهەلوەرینن، هەکە ئەڤ میکرۆبە نەبانە، نە ئەو خواردن دهەلوەریان و کەسەك ژی نەدشیا بخۆت ئەڤ میکرۆبێن ژ ڤی بابەتی ب ڕەنگێ بەکتریا و پەمبلوك و هێڤێنی دایە. هەروەسا هندەك میکرۆبێن دی یێت هەین هێشتا بو زانا دیار نەبوویە کا چنە و چ نینن.

ئەرێ ل ڕێزا گیانداران یان بێ گیانانە یان نیڤ یان نیڤ ب نیڤ؟ ئەڤێ چەندێ ژی دبێژنێ (ڤایرۆس)، کو دبنە ئەگەرێ هندێ ڕووەك و زیندەوەرو مرۆڤی تۆشی گەلەك نەخۆشیا بکەن. ڕووەك تۆشی نێزیکی سێ سەد، زیندەوەر تۆشی نێزیکی شێست، مرۆڤ ژی تووشی پتر ژ شێست نەخۆشیا دبیت، ژوان نەخۆشییێن مرۆڤی پێ تووش دبیت خۆریك و سوورك و پەرسیڤ و ڤالینجا زارۆکانە. مرۆڤی گەلەك ل ڤان میکرۆبا ڤەکۆلییە،

بۆ هندێ دابگەهتە ڕە و ریشالێن وی و بشێت ژناڤ ببەت و نەهێلیت ببنە جهێ نەخۆشیێ و دەردسەریێ.

زانست دڤێ مەیدانێدا سەرکەفت و سەروان ڕەنگێن میکرۆبا زاڵبوو ئەوێن دبنە جهێ نەخۆشیێ کارەك کر کو مرۆڤ ژێ نەترسیت و ڤەنە جنقیت و هەر دگەل سەرهەلدان و پەیدابوونا وان دا دەمل دەست ژناڤ ببەت و نەهێلن بەلاڤە بن. گەلەك پسپۆر دڤێ بیاڤی دا پەیدابوون، نەك هەر ئەو بتنێ بەلکی زانستێ بەکتریا و پەمبلوك و ڤایرۆس و ئەڤ بابەتە ژی پەیدا بوون. بۆ نوکە ژی ب پشت ڕاستی ڤە دێ شیێن بێژین کو زەمانی دەردگرتن و پەژیك و قڕببن و چ ژێ نەمینیت و ژناڤ بچن. نوکە مرۆڤ ب دەرزی دانانێ خۆ ژڤان بەلا ڕزگار دکەت. ئێدی بۆ ساڵەکێ بیت یا نبۆ چەند سالان یان ب درێژیا ژیانێ ئەو ڕەنگێن نەخۆشیا نێزیك نابن.

نوکە بلا بێینە سەر دەسپێکا سوحبەتا خۆ و بزانین ئەرێ میکرۆبێ دۆست هەیە؟ یان ب ڕەنگەکێ ڕوونتر بێژین ئەرێ ڕاستە کو ژیان بێی میکرۆب پێك ناهێت و ناچیتە سەری؟ یان ئەو رۆلی مەزن چییە یێ کو ئەڤ میکرۆبە دخواردن و ڤەخوارنێ دا و چاندن و پیشەسازیێ دا دگێڕن و دبنە جهێ ژیانێ؟!.

ب ڕاستی و دجهێ خۆدا بوو کو زانایەك ژ ئەنجامێ ڤەکولینەکا دوورو درێژو زانستیانە ل ئەمریکا، ئەو چەند دیار کرییە کۆ میکرۆبێ زیاندار بەرامبەر میکرۆبێ بێ زیان ژ سێ هزارا ئێکە. بەلێ زەلامەکێ خراب بەرامبەر زەلامەکێ باش ل جیهانێ ژ یازدە هزارا ئێکە هەمی زیندەوەر

دمرن، هوین باش سەحا هەر ڕووەکەکی یان زیندەوەرەکی یان مرۆڤەکی بکەن، دێ بینن ژیانا وان ژ شانەکێ دەست پێ دکەت و پێشڤە دچیت، هەر زیندەوەرەك چەند دەمژمێرەکا یان چەند ڕۆژەکا یان چەند حەفتیەکا یان چەند سالەکا دژیت. هندەك زیندەوەر ژی یێت هەین وەکی کویسەلەکی ژیێ وی خۆ ل دوو سەد سالان ددەت. هەروەسا هندەك دار ژی بێت هەین وەك دارا (سکۆیا) چەند هەزار سالا دژیت. هەر زیندەوەرەك دەمی دمریت ب ملیونان بەکتریا هێرشێ دبەنە سەرو لەشێن وان پرت پرت کەن و دکەنە خوارن بۆ وان زیندەرێن ساڤا ئەوێن ژ نوی وەرارێ دکەن و پێ دگەهن. هەکە ئەڤ میکرۆبە نەبانە. ل وێ ڕۆژا ژیان ل سەر ئەردی پەیدا بووی و هەتا نوکە لەشێن مری دا دجهدا مینن. ئەڤجا دەشت و چیاو ئەرد هەمی دا پڕبن ڕێ بۆ ڕێوباری نەدبوو. ئەڤە ژ لایەکی، ژلایەکێ دیڤە ب هزاران رەنگێن زیندەوەرو ڕووەکا وەرار نەدکرو مەزن نەدبوون، نە بەلکی ژیانا وان دا کەفتە د زڤرۆك و گەڕیانێ داو دا ڕاوەستیێت، چونکو ب ڕاستی ئەو میکرۆب ڕۆلەکێ ئێکجار دگێرن بۆ هندێ کەرستێ ئالۆز وەك پرۆتین و روین و کاربۆهیدرات بکەنە کەرستەکێ سڤك و وەلێ بکەن کو شتلا ساڤا بشێت وان بمێژیت و وەرارێ پێ بکەت. هەر ژبەر ڤێ ژی دێ شێین بێژین ئەڤ میکرۆبە ئاخێ قەلەو دکەت و هەردەم دێ تێڤلەکێ نوێ دەنێ بۆ هندێ دا ئەو زیندەوەرێن ژنوی سەری هلدەن پێ بژین. بەلێ ئەڤ میکرۆبە جارەکێ بتنێ و میکرۆبەك بتنێ، زیندەوەرو ڕووەکا نا هەلوەرینن. بەلکی ب چەند جاراو هەر جار ژی کۆمەکا میکرۆبا ئەڤێ کاری بجهـ دئینن، ئانکو

دێ کەنە خوێ یا سادە یا کانزای وەك ئازۆت و کبریتات و فۆسفات و نشاو ئاڤێ. پاش دووەم ئوکسیدێ کاربوون دێ بلند بیت. ڕووەك دێ لسەر دووەم ئۆکسیدێ کاربوون و ئاڤێ و لبەر تیرۆژکا هەتاڤێ جارەکا دی کەرەستێ ئالۆزو ڕەق دروست دکەت و ئێدی ب ڤی ڕەنگی ژیان دێ گەریێت. ئەڤەژی هەر وەکی دەستورەکێ ژیانێ وەسایەو ڕێژا دووەم ئوکسیدێ کاربوون دێ ب نەگۆڕی مینیت و دبنە نێزیکی ٣،٠٪ د هەوایێ ئاسایيدا. هەروەسا پرۆتین ژی ب ئەگەرێ کۆمەکا میکرۆبێن تایبەت دێ هەلوەریێت، هەر دێ هەلوەریێت، هەتا دبیتە ئازۆت، ئەڤ ئازۆتە ژی، لنك ڕووەکی گەلەك خۆش دبیت و دێ مێژیت و پێ ژیت. بەلێ هەکە برۆتین هەر وەکی خۆ ب پروتین ما، ڕووەك مفای ژێ نابینیت، نەبتنێ هەر ئەو بەلکی رووەکا ژی دێ ژناڤبەت. هەکە وەسابیت، ئەڤ میکرۆبە بێ گومان دۆستن و خزمەتەکا مەزن بۆ مرۆڤی دکەن و دێ مفایەکێ مەزن ژێ گەهینن، ئەڤ میکرۆبێن دۆست بێدەنگ و هێدی خزمەتەکا مەزن بۆمە دەکەن. زانایان بخۆ ژی ئەڤە نەدزانی و ل ڤێ دوماهیێ و پشتی ژیان ب سەدان هزار سالان بەردەوام بووی، پاش ئەڤ راستیە بۆ وان خویا بوو.

هندەك جۆرێن بەکتریا یێت هەین د ڤەلەوکرنا زەڤیێدا ڕۆلەکێ مەزن دگێرن هێڤێن و بناڤ و دەنگترین میکرۆبە کو د خوارن و ڤەخوارنا مە دا بکاردئینین، ئەرێ ئەو نانێ دخوین ب هەڤیر ترشی ناهێتە دروست کرن؟!.

دیسان هندەك خوارن یێت هەین، هەكە هێڤێن نەبایە دروست نەدبوون.
هەروەسا مەی ژی ب هێڤێنی دهێتە دروست كرن، پەنیرو ماست ژی یا ن بۆ مەیاندنێ یا ن بۆ تام خۆشكرنێ هێڤێن دڤێت، هەروەسا سهك ژی پێدڤی ب هندەك مێكرۆب هەیە و ب وان میكرۆبا ترشوكا سهكێ دروست دبیت.

بۆ بابەتێ جلكا دیارە وێ دزانین كو كەتان ئەڤ ڕەنگێن تشتا ب ئەگەرێ كارتێكرنا میكرۆبێ تایبەت دهینە چێكرن، چونكو ئەو میكرۆب تایبەتییە و هندەك ژوان كەرەستا د هەلینیت ئەوێن ڕها ب ڕووەكی دنویساند. ئەڤ میكرۆبێن دۆست هەر ب ڤان خزمەتا نەڕاوەستان، بەلكی گەلەك پیشەسازێن دی یێت هەین و ب ئەگەرێ ئەڤانە دهێنە بجە ئینان، بۆ نموونە بەهرا پتر یا وان ترشوكا ئەوێن بۆ ڕەنگ كرنێ بكاردهێن، هەروەسا گەرماردانا پیستی و بۆیاغكرن و ڕیشالێن دەستكردو گولاڤ و مەركەب و لاستیكێ دەستكردو گلیسرین و گەلەك ڕەنگێن دی.
میكرۆبێن دۆست ل ڤان هەمی پیشەسازیاندا بۆ هندێ كو تێكەل بوونەكا كیمیاوی ب ساناهی دكەن. خزمەتەكا مەزن دگەهینە مرۆڤ. بەری دوماهیێ ب سوحبەتا خوبینین، ب فەر دزانین كو پیچەكێ بەحسێ وان میكرۆبێن دۆست ژی بكەین ئەوێن گەلەك نەخۆشی و دەرد ساغ كرین وەك پەنسەلین، سترۆپتۆمیسین و كلۆرومیسین و ئۆرۆمایسین. ئەڤە ژ هندەك بەكتریا و هندەكێن دی ژ پەمبلوكی د هێنە ڤەگرتن، نوكە ئەڤە ب ڕەنگەكێ ئێكجار بەرفرەهـ بۆ تیماركرنێ دهێنە بكارئینان، مرۆڤایەتی لژێر سیبەرا ئەڤان ژ دەست گەلەك نەخۆشیان ڕزگاربوویە. ل ڤێ

دوماهیێ زانست شیا ب ڕەنگەکێ بەرفرەهـ ئەڤان درمانا چێکەت و ب وی ڕەنگی کو هەمی کەس ل هەر قولاچ و کوژیەکێ جیهانێ دابن، بساناهی بدەست بکەڤیت و ل بازاری وەك ئەسپیرین دهێنە فرۆشتن. قوتابیێن خۆشتڤی. دیارە نوکە هوین تێگەهشتن کو ئەڤ میکرۆبە دۆست وئەم لسەر هەڤیێ بووین، کو مەهۆسا ناڤ لێ نای، ژیان و ژیار ب ئەگەرێ ئەڤانەیە، ڕاستە ئەو زیندەوەرەکێ بچویکن، بەلێ خزمەتاوان گەلەك مەزنە.

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

حێبەتی : سەرسوڕمان.

دەمل دەست : دەم و دەست.

گڤێرینێ : هەرس کرن.

د هەلوەرینن : خاڤ دکەت.

پەمبلوك : کەڕوو.

هێڤێن : هەوێن، هێوێن.

خوریك : ئاوڵە، خوڕۆکە.

سوورك : سورێژە، سۆرکە.

پەرسیڤ : پەسیوو.

رەهەوریشاڵ : بنج و بناوان، رەگ و ریشە.

ڤەنە جنقیت : نەسڵەمێتەوە.

ئێشا زراف : سیل.

پشت ڕاستی : دڵنیابوون.

پەژیك : پەتا. نەخۆشی.

دەرزی دانان : كوتان.

زیاندار : زیان بەخش.

زەلام : پیاو.

دەمژمێر : سەعات.

چەریت : دەلەوەرێت.

تیرۆژك : تیشكی خۆر.

مفا : سوود.

خویا بوو : دەركەوت. دیار بوو

هەڤیر ترش : هەوێن، هەویری ترش.

مەیاندن : مەیین. مەهاندن

دحەلینیت : دەتوێنێتەوە.

نویسا : دەنوساند.

بەهراپتر : زۆربە.

گەماردان : پێستە خۆشك كردن.

قولاچ و كوژی : كەل و قوژین.

سهك : سركە.

## شاعیر و نەتەوە

ئەو بیتانۆکا سوور یا کو ل بەهارێ دەشت و ئەرد و دۆل و نهال و بنارێت چیا دخەملینیت. هند پێناچیت دێ چرمسیت و هشك بیت و دێ بیتە پیش و پەلەخ، بەلێ دشیعرا شاعیراندا هەر بیتانۆکەو هەر نازبیت خو دکەت و خو د هەژینیت. دەمێ تو شیعرێ دخوینی بیتانۆك ب دروستی و وەك خو دێ هێتە بەرچاڤێت تەو وەسا دێ زانی کو وەرزێ بەهارێیە و بیتانۆك دهێنە بیراتە.

گرنژینا سەر لێڤێت زارۆکی هندی بێژی دلڤەکەرە و تەزینەکەکا خۆشە بسەر لەشیدا دچیت، بەلێ تنێ ئاخینکەك بەسە بۆ هندێ وەك لێمشتێ بیت و دگەل خو راپێچیت، لێ ئەو گرنژینا ل سەر لێڤا زارۆکی د شیعرا شاعیراندا هەردەم نەمرە ولبەرچاڤە.

شاعیر ئەڤی هەستێ نازك و شهدارێ خو ب زمانێ نەتەوەیی دادرێژیتە سەر کاغەزێ، هەر هند بەسە کو برژیتە سەر کاغەزێ و ئێدی ڤەمراندنا وێ نینە و هندی دنیا دنیایە هەر دێ مینیت. هەتا ئەو شیعر ژی ئەوێن ئاوازا مرۆڤایەتی و خێر و بێرێ کوێر دکەن. ئەو شیعرێن ئاوازا ئاشتی و تەناهیێ دئێخنە دگوهێ خەلکیدا. هەر ب زمانێ نەتەوەیی دهێنە گوتن. ئەڤجا ژڤی لایڤە ئەم دشێین بێژین کو شاعیرێ چاك و باش دشێت ب شیعرێن خو خزمەتا نەتەوەی بکەت. چونکو (ئەدەبێ خۆش وب لەزەت زمانی لنك کەسێن مللەتی خۆشتڤی دکەت و رۆژ بۆ رۆژێ دبنە هوگر و شانازیێ پێ دبەن، من گەلەك جاران گوە لێبوویە کو ئێك گوە ل شیعرێن باش یێن گۆرانی، یان

پیرەمێرد، یا خانی، یان هەردی، یان هێمن موکریانی بوویە، و قوربانی وی زمانی ژی بوویە کو هۆزان پێ هاتیە گوتن، دیارە ئەڤ قوربانی بوون وشانازییە ئۆتۆماتیکی دبیتە قوربانی بوون وشانازی ب مللەتی ڤە، وئەڤەژی ئێکە ژ وان هۆیا کو دهێتە گوتن هۆزانڤان و ئەدیب ب رێکا خزمەتا زمانی، خزمەتەکا مەزن نەتەوەی دکەن.)[1]

هوزانا نەتەوەیا کوردی ژی رۆلەکێ بلند دمێژوویا نەتەوەیێ کوردا دیتییە، دگەل ئازارو هیڤی و ئومێدێن مللەتی دا بوویە، خەلك هۆشیار کرینە، دەستێ خۆ دانایە سەر برینێن مللەتی وخەلك پالڤەدایە بۆ چارەسەریێ و ڕاپەرینێ، ئاگاداریا وان کرییە کو بێ دەنگ نەبن، سەری نەچەمینن و ب بن دەستییێ ڕازی نەبن، ودڤێت ئازادی خواز و رزگار پەرست بن.

ڕەسەناتیا هۆزانڤانێ نەتەوەیی دهندێ دایە گیانەکێ هۆنەرمەندانە هەیە، دگەل خۆ ودگەل خەلکی دا یێ راستگۆیە، خۆشیا وی یا کێمە وخەمێن زۆر هەنە، گەلەك جاران یێ ب کۆڤانە و گەلەك کێم یێ دلخۆشە، ئەڤ ڕەسەنی و ڕاستگۆییا هۆزانڤانی بوویە جهی برس و زیندان و تێکچوون و دەربەدەریا هۆزانڤانێ رەسەنێ نەتەوەیی، وهەر دڤێت وەسابیت دمەیدانا رامیاری دا رۆلەکێ ب جەرگ و خەباتکەر و هۆزانڤانەکێ راستگۆبیت، وهۆزانێن وی پڕبن ژ ئازار و ئەشکەنجەدانا گەلی و شۆڕشا مللەتی و مزگینیا پاشە رۆژێ و باوەریا بهێزا ب نەتەوەیێ وی یێ خۆشەویست.

(ل سەر شێوێ (الشاعر والامة) ئەڤا د پەرتووکا خوێندنا عەرەبی یا پۆلا یازدی ئامادەیی هاتیە دارشتن).

---

(١) چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی شاعیر، ژ نڤیسینا فەرەیدوون عەلی ئەمین.

## گاليلو ٚ

بەری ٣٧٩ سالان، ل سالا (١٦٣٣)ێ، دادگەها تەفتیشێ ل باژێرێ رۆما ل ئیتالیا حوکم ل سەر گالیلۆی دا، چونکو بیردۆزا (کۆپەرنیکۆس)ی پەسەند کر بوو کود گوت ئەرد ل دۆر تەوەرێ خۆدا دزڤڕیت.

ئەڤرو ئەگەر بێژینە قوتابیەکێ قوتابخانەیەکا بنەڕەتی: (ئەرد ل جهێ خۆ یێ راوەستیایە و نالڤیت، رۆژ ل دۆر وی دزڤڕیت) دێ تڕانە و سڤکیێ ب مە کەت، چونکو ئەڤرۆ لدەڤ هەر کەسەکی ئاشکرابوویە کو ئەرد ل دۆر خۆ دزڤڕیت ول دۆر رۆژێ دزڤڕیت، لێ زانایێن وی سەردەمی وەسا دزانی کو ئەرد یێ دجهێ خودا راوەستیایە، و رۆژ و هەیڤ وستێر ل دۆر وی دزڤڕن.

ل سەدێ پازدێ زاینی، زانایێ ب ناڤ و دەنگ (کۆپەر نیکۆس) دەست ب تێگەهاندن و بەلاڤکرنێ کر دناڤ خەلکی د اکو بەرۆڤاژی بۆچوونا وان یا دروستە وئەرد نە یێ راوەستیایە، بەلکو ئەرد و هەیڤ و هندەك ژ ستێران ل دۆر تەوەرێ خۆ دزڤڕن، وئەڤ بۆچوونا و بیردۆزا کۆپەرنیکۆسی دناڤ خەلکی دا دەنگ ڤەدایە وبەلاڤ بوویە.

ئەگەر کۆپەرنیکۆس هەتا زەمانێ گالیلۆی ژیابا، بێ گومان دادگەهاوی دا بەری دادگەها گالیلۆی بیت.

گالیلۆ ل سالا ١٥٦٤ ل باژیرێ (پیزا) ل ئیتالیا ژ دایك بوویه، دزانستێ بیرکاری و فەلەك و فیزیکێ دا گەلەك پێشکەفت بوو، هەمی جیهان قەرداری شیانێن ڤی زانایێ خۆشەویستن کو (تەرمۆمەتر) و (تلیسکۆب) یێن ڤەدیتین، هەڵبەت خەباتا ڤی زانای هەمی ل سەر پەیڕەوێ تێکۆشان و تاقیکرنێن کۆپەرنیکۆس بوون. وئەڤ هەردوو ڤەدیتنە دناڤ خەلکی دا بەلاڤ کرن، وخەلك ئاگەهدارکرن ب بیردۆزا کۆپەرنیکۆسی. ب ئەڤێ کریارێ گالیلۆی دناڤ پیاوێن ئایینی و زانایێن وی سەردەمی وەك بۆمبەیەکێ تەقاند، وبگروڤەکێش کەتە دناڤ بەرا وان دا و بارێ وانا تێکدا، ئەوان بڕیاردا کو گالیلۆ کافرو زەندیق وبێ باوەرە. ب ڤی رەنگی ئەڤان زانایان (پاپا) پالڤەدا کو دژی گالیلۆی ب راوەستیت و دەست ژ ئەڤان بۆچوونان بەردەت و فەرمان دا ئێدی گالیلۆ وانەیان د زانکۆیێن ئیتالی دا نەبێژیت. گالیلۆ نەچار بوو دەست ژ تێکۆشانا ئاشکەراو بەلاڤکرنا بیرو باوەرێن خۆ بەردەت، چونکو پێ چێ نەدبوو هەڤڕکیا پاپا و میرنشینێن ئیتالیا بکەت.

گالیلۆی جارەکا دی ل سالا ١٦٣٢دا بیروباوەرێن خۆ و بیردۆزا خۆ ئاشکەراکر، وگوتی نەشێم بەرانبەری راستییەکێ بێ دەنگ بم، وپتریا خەلکی ب خەلەتی یێ تێدگەهن، پەرتووکەك دا چاپێ وبەلاڤکر، وتێدا بیردۆزا کۆپەرنیکۆسی پەسەندکر.

دوژمنێن وی زانین پەرتووکا وی دەست بۆ دەستی یا بەلاڤەدبیت وکەڤتە لڤینێ، ئینا نڤیسەرێ وی رەوانەی (دادگەها تەفتیش) کر، ئانکو (دادگەها جەزایا پاپا)ی، چونکو ئەڤ کریارە ب کوفر ل قەلەم دا، و وی دەمی دا حوکمی کەنیسێ ویێ پاپای ب سەر هەمی خەلکی دابوو هەتا ب سەر میر

و سەرکێشێن ئەوروپا ژی دا یا زاڵ بوو، هەمی جیهانا کریستیان مل کەچی پاپای بوون، ب ڤی رەنگی ئەڤ زانایێ پیرێ خوشەویست ل ژیێ (٧٥) سالییێدا هاتە رەوانەکرن بۆ دادگەها تەفتیش، دادگەها وی (٢٠) رۆژان ڤەکێشا، هەڤال و دۆستێن گالیلۆی وەسان هزرکرن کو گالیلۆ دێ بەرگرییێ ژ بیردۆزا خۆ کەت و دێ بۆ وان سەلمێنیت کو بیردۆزا وی یا راستە، لێ وی وەنەکر چونکو دزانی کو بەرگیری و ئاخڤتن بەرانبەری وان بێ مێشکان ئەوێن رازی نەبووین دادگەها وی رەوانەی دادگەها جەزاییا مەدەنی بکەن یا بێ مفایە، چونکو ئەوان دزانی ئەگەر وی رەوانەی دادگەها جەزاییا مەدەنی بکەن دێ شێت بیردۆزا خۆ بۆ ئەندامێن دادگەهێ سەلمێنیت. نە ب ڤێ چەندێ راوەستیارین. بەلکو زۆری لێ کر نکو ل بەرانبەری خەلکی ئاشکەرا بکەت کو بیرو باوەر و بیردۆزا خۆ ب خەلەتی بدانیت ودیاربکەت کو ناگونجن دگەل نەریتێ کەنیسێ، چونکە کتێبێن پیرۆزێن وان (ئینجیل) باسی هندێ ناکەن کو ئەرد ل دۆر تەوەرێ خۆدا دزڤریت ول دۆر رۆژێ ژی دزڤریت، ئەوان گوت:

ئەڤ بیردۆزە خەلەتیەکێ ب یاسایا زانستێ فەلەکێ دەردئیخیت ویاسایا دنیایێ ژی تێك ددەت.

گالیلۆ تەنگاڤ کر کو بیردۆزا خۆ ب ئاشکەرا ب درەو خەلەت دەربێخیت، پاشی گالیلۆ ل سەر چۆکان راکێشا دا وێ ناما وان نڤێسی کو بیردۆزا وی ب درەو دیارکەت ب زۆری ئیمزابکەت، لێ ئەو رابوو سەرپێن خۆ وب هەمی هێزا خۆ گازی کر

((دگەل ئەڤێ ژی دا هەر دزڤرینێدایە)) مەبەستا گالیلۆی ئەڤەبوو کو تێ

بگەهن هەر چەندە ئینکار ناما بیردۆزا وی ب زۆری پێ هاتیە ئیمزاکرن، لێ ئەرد هەر دزڤرینێ دایە و زڤرینێ نەکەتیە وناکەڤیت.

دادگەها تەفتیش بەلاڤ کر کو گالیلۆی ل دادگەهێ دا دان پێدانا ب خەلەتیا بیردۆزا خۆ کرییە، ژبەر هندێ بڕیاردا کو ل خانیێ وی ل (ئەرستری) بهێتە دەستەسەرکرن، ب مەرجەکی ژ ئێدی وێڤە بیرو باوەر و بیردۆزا خۆ بۆ هیچ کەسەکی نەبێژیت بیردۆزا کوپەرنیکۆسی ل سەر ئەزمانێ وی نەهێتە گێران ڤە، پاشی دادگەها تەفتیش ب جاسووس و پۆلیس و قەشەیێن خۆ چاڤدێری و سەرپەرشتیا گالیلۆی دکر.

ئەڤی زانای گەلەك کەساسی و هەژاری ل دویماهیا رۆژێن ژیانا خۆ دیتن، ل سالا (١٦٣٤)دا کچا وی یا خۆشتڤی وەغەرکر، جەرگێ وی سووت، وهەست وهۆش نەمان، ل سالا (١٦٣٦)دا نەساخ بوو وهەردوو چاڤێن وی کورە بوون، ل سالا (١٦٤٢) د وی خانیێ دەستەسەرکری دا وەغەر کر، وئەڤە سالا مرنا وی یە، لێ گالیلۆ وەك یادگارەکا نەمرە دناڤ کۆڕێ زانست و کۆمەلا زانایاندا.

دۆزا گالیلۆی ژ وان دۆزایە کو زۆرداریەکا روون و ئاشکەرا تێداهەیە، ئەو جۆرێ خەلەتیێ تێدا دیاردبیت کو گەلەك جاران دادگەه دادپەروەریێ ل بن پێ دادنن ژبەر مەرەمێن تاکە کەسی.

گەلەك جاران دەلیڤە پەیدادبیت دادپەروەری ل بن پەردا ناپاکیێ دا دهێتە ڤەشارتن، چرایێ راستی و سەربەستیێ و ئازادیێ ل بن هێزا ڕەشی و نەهەقیێ دهێتە ڤەمراندن.

ژ گۆڤارا گەلاوێژ ژمارە (٩ - ١٠) ل سالا (٣)ێ (١٩٤٢) ب دەستکارییەکا کێم هاتیە وەرگێران.

## ڕاڤەکرنا پەیڤان:

نەریت : عرف وعادەت.

زۆری : زولم.

بیردۆز : تێور.

## دان و ستاندن:

١-کۆ پەرنیکۆس وگالیلۆ کی بوون؟ و چ دزانی دەربارەی بیردۆزا وان؟

٢-ئەرێ ئەو دادگەها کو بۆ گالیلۆی هاتییە دانان ناڤێ وێ دادگەها تەفتیش بوو، لنك تە ئەوا دادگەە و حوکمێ وێ یا ڕەوابوو؟ بۆچی؟

٣- ئەرێ تۆ دشێی ناڤێ چەند کەسەکان یان رویدانەکان بێژی کو ب ڤی رەنگێ حوکمەکێ ناهەق ل سەر هاتبیتە دان؟

زناڤبرنا نەخواندەڤانیێ پێنگاڤەکا

بوێرە بۆ بنیاتنانا مرۆڤێ نوی.

## بەرهەمێ زۆر و دابەشکرنا دادپەروەرانە

وەسان دهێتە گوتن کو نڤیسەرێ ب ناڤ دەنگێ ئنگلیز (بەرناردشۆ)، جارەکێ دئاهەنگەکێ دا چاڤێ وی ب ئێك ژ سەرمایەدارێن مەزنێن بەریتانیا دکەڤیت، کابرایێ سەرمایەدار یێ قەلەو و چوار مل و وزگ مەزنە، وەکی ئەم دزانین بەرناردشۆ ژی یێ زەر ولاوازو زراڤ وسەر رویت بوویە.

کابرایێ سەرمایەدار دبێژتە (بەرناردشۆ)یێ نڤیسەر:

-ئەوێ تە ببینیت وەسا دێ زانیت، کو ل بەریتانیا برسە و خەلایە و نەبوونی یە، نە نان دەست کەڤیت ونە خوارن.

-بەرناردشۆی بەرسڤا وی دا، وگوت:

لێ ئەوێ تەبینیت وەسا دی زانیت کو هۆیێ ئەوێ برس و خەلا و نەبوونیێ تۆی وهەر چ بەرهەم و نان و خۆراکی ل بەریتانیا هەبیت تە یێ بری بۆخۆ دا بخۆی وتێرا کەسێ نەمایە.

دیارە ئەڤ ئاخفتنا خۆش دهێتە ڤەگێران، چونکو مەرج نینە سەرمایەدار هەر یێ قەلەو زۆر خۆربیت، چونکو گەلەك جاران هەیە کابرا ملیۆن زێر هەنە و ژبەر نەخۆشی و نەساخیێ نەشێت پاریەکی ب دلێ خۆ بخۆت.

مەکسیم گۆرگیێ نڤیسەرێ مەزنێ سۆڤێتی جارەکێ دچیتە ئەمریکا وحەز دکەت ئێك ژ خودانێن ملیۆنان ببینیت، لنك گۆرگی یا سەیر بوو کو کابرایێ ملیۆنێر گەلەك یێ لاوازە ورەنگ زەربوو، ژبەر نەخۆشیا شەکرێ وچەند نەخۆشیێن دی هەر چ خوارنێن خۆش ژێ هاتینە قەدەغەکرن، گۆرگی دبێژیت:

بەری نهۆ من وەسا دزانی ملیۆنێر پێدڤی یە زەلامەکێ گەلەك قەلەو بیت، حەفك ستویربیت، ب کەلەخ و سوور و سپی بیت، رۆژێ چەند مریشك و عەلوك وچەند سێنیکێن پەقلاوێ دخۆت، لێ من ملیۆنێر وەسا دیت، دلێ من زۆر پێ ڤەما، هندە وژدانا خۆ ئازار بدەت، وهند خەلکی ئازار بدەت، وزەحمەتا وان بخۆت و هندەك جاران ب دەهان هزار بدەتە کوشتن، شەڕی ب هل ئێخیت د اکو چەکی بفرۆشیت وپارەکێ زۆر پەیدابکەت، لێ نەشێت هندی بچویکترین کرێکارێ ئێك ژ کارگەهێن خۆ سوود و مفا ژ هەوڵ ولەشێ ساخێ خۆ ببینیت.

گۆرگی دگەل ڤێ چەندێ پرسیاردکەت: بۆ چ کابرایێ ملیۆنێر ئەڤی کاری دکەت وئەڤ پارێ زۆر بۆ چی یە؟

رەنگە ئەڤ نەخشەو تابلۆیە مەکسیم گۆرگی ژی هەر ژدەڤ خەیالا خۆ ئینابیت وەکو تشتەکێ خۆشی وگالتە پێڤەدیاربیت. لێ ئەڤەژی وئەو ئاخفتنا خۆشا مە ل سەر زمانێ بەرناردشۆ ڤەگێرای دبنیاتدا رامانەکا زۆر کویر تێداهەیە ودیمەنەکێ رژێما سەرمایەداری یە، رژێما چەوساندن ورەنج خوارنێ دیاردکەت.

کۆمەڵەکا زۆر ژ زەحمەت کێشان، ژ جوتیاران و کرێکاران ڕەنج ددەن، چ خێر و بەرەکەت هەیە، بەرهەمی دئینن، جەرگێ ئەردی شەق دکەن و دادپۆشن و ئاف ددەن و بهێزا خۆ وب هەمی شیان و دەمێ خۆ شەڤ و رۆژ کاردکەن، دسەرمایا زڤستانێ دا ول گەرما هاڤینێ دا، د رۆژانێن دل تەنگێن پایزێ دا، ول بەر بهاراندا بەردەوام یێ ل بەرهەم ئینانێ و پاراستنا وی بەرهەمی دا نا راوەستن، ئەردی پڕ دکەن ژ بەرهەمێ جوانوشرین وب مفا،

ئەو دزۆرن و بەرهەمێ وان زۆرترە، لێ ئەو بەرهەمە بۆ کێ یە؟ و چەوا دهێتە دابەشکرن؟

دەمەکە فەیلەسووف وهۆزانڤان خەونێ ب هندێ ڤە دبین کو ئەڤ بەرهەمێ زۆر ب سەر وان بەرهەم هێنەران بهێتە دابەشکرن، وهەر کەسەکی بەهرا وی بەربکەڤیت، ئەنجام وبەرهەمێ رەنجا خۆببینیت، لێ کەنگی ئەڤ خەونە بۆیە راستی؟ کەنگی بوویە خودانێ ڤێ رەنج و خێرو بەرەکەتێ کەیف وخۆشی ب زەڤی و ئاڤا خۆ ببەت وب داخ و حەسرەتا نەخۆشی وئازارێ ماڵ ئاڤاییێ نەکەت؟

مێژوو بەری رژێما ئیشتراکی، هیچ رژێمەکا دی نەدیتیە، کو بەرهەمێ زۆر، عادلانە و ول دویڤ ئیشتراکییەت هەر ئەڤە نینە کو (دنکێن گەنمێ ب پیت و بەرەکەت بکەڤنە دعمباران دا) و ئەو عەمبارە ژی ب ڕازەمەندیا هەمی خەلکی بۆ وان بیت یێن زەڤیێ بچینن، بەلکو ئیشتراکییەتێ پلا بەرهەم ئینانێ بلندکرییە، ل گوندان هێدی هێدێ تەکنیکا نوی دچاندنێدا یێ بکاردئینن، باژێرێن بەری پاشکەڤتی یێ دهێتە ئاڤەدانکرن ویێ پێش دکەڤن، نموونا شارستانەیتێ یە، پیشەسازی تازەترین بەرهەمێ داهێنانا مێشکێ مرۆڤێ تازەیە، ئەڤ  هەمیە ژی مولکێ هەمیانە، بەرهەم ژی بۆ هەمیانە. کۆشك و تەلارێن تاکە کەسی یێن سەرمایەداران دێ بنە مولکێ گشتی ودگەل وان خانوو و بەرەیێن گەورە دێ سەر کارگەر و بیر رووناك و هەمی کەسان دا ل دویڤ خێزان و پێویستییێ دێ هێنە دابەشکرن.

هەتا دهێتە سەر نەخۆشیێ و پزیشك و دەرمان و نەخۆشخانە وەك ئێك بۆ هەمیانە وبێ پارە دێ هەمیا بن ونابنە رێکەك بۆ پرکرنا بەریکێن هندەکان ب پارا وخەلکی رویت بکەن.

داینگەهـ و باخچێن زارۆیان و قوتابخانە و خواندنا بالا و هزارەها پرۆژە و کارخانێن مەزن بۆ هەمیانە، بۆ زارۆیێن جوتیار و کارگەە و فەرمانبەر و بیر رووناك و هەمی کەسان وب ئێك رەنگ دێ هێنە پەروەردەکرن بۆ نیشتمانی و وەلاتی بەختیاریێ پەیدادکەن. ئەڤەژی هەمی بەرهەمن. بەرهەمێ زۆر وب پیت وخێرن، ب پەروەردانە دهێنە دابەشکرن وبۆ هەمیانە، نموونا ژیانا بەختەوەرا خەلکی یە. تا کاروانێ خەباتا زەحمەتکێشانێ بەرەڤ پێشتر بچیت . . ئەڤ بەختیاریە د زێدەبوونێ و کویر بوونێ وهەمەرەنگیێ دایە. هەر ژیانە و کاروانە و سەرکەفتن وشادی . . . ئاشتی بۆ گەلان وشادی وبەختیاری وبەختەوەری بۆ هەمی لایەکی.

## دان و ستاندن:

١-ئەرێ تۆ دشێی تشتەکێ وەسان ب ڤەگێری کو نێزیکی ئاخفتنا بەرنادشۆ و گورکی بیت.

٢-تۆ چ دەربارەی بەرنادشۆ و گۆرکی دزانی؟

٣-بۆچی درژێما دەرەبەگیێ وسەرمایەداریێ دا زۆر جاران رێك ل بەرهەمێ زۆرییێ دهێتە گرتن؟

٤-چەوا بەرهەمێ زۆر بۆ هەمیانە؟ دچ رژێم دا؟

٥-چەوا خەلك ژیانا بەختەوەر بۆ خۆ پەیدادکەن؟

٦-هەڤبەرکرنێ بکە دناڤ بەرا رژێما سەرمایەدار و ئیشتراکی دا ژ هەمی لایەکی ڤە.

**جڤاکێ خواندەڤان جڤاکەکێ پێشکەفتی یە.**

# کەرکووك

کەرکووك ئێکە ژ پێنج باژێرێن مەزنێن باکوورێ عیراقێ و باژێرێ چوارێ یە ژ کوردستانا عیراقێ، باژێرەکێ گەلەکێ کەڤن وب ناڤ و دەنگە، یادگارا رۆژهەلاتێ کەڤنە و ژ دەمێ کەڤن وەرە مایە تانهۆ. باژێرێ کەرکووکێ (١٢٦٠) هزار و دووسەد وشێت پێیا یا بلندە ژ روویێ ئەردی، و (٢٨٥) دوو سەد و هەشتێ وپێنج کیلۆمەتران ژ بەغدا یا دویرە. پاناتیا دەڤەرا کەرکووکێ (٢٠٨٠٠) بیست هزار و هەشت سەد کیلۆمەترێن چوار گۆشەیە. ژمارا دانیشتیێن وێ نزیکی (٤٦٠٠٠٠) چوار سەد وشێست هزار کەسە. پارێزگەها کەرکووکێ ژ شەش قەزایا پێکهاتییە:

١-قەزا کەرکووکێ: پێکهاتییە ژ ئەڤان ناحیا:

قەرە حەسەن ، پردێ شوان ، تازە ، دووبز

٢-قەزا کۆری: پێکهاتیە ژ (٤) چوار ناحیا:

پێباز، قەرەتەپە ، سەرقەلا، جەبارە.

٣-قەزا تووزخورماتوو: پێکهاتیە ژ (٤) چوار ناحیا:

قادرکەرەم، داقووق، ئامەرلی، سلێمان بەگ.

٤-قەزا چەمچەماڵ: پێکهاتیە ژ (٢) دوو ناحیا:

ئاغجەلەر و سەنگاو.

٥-قەزا حەویجە: پێکهاتیە ژ (٢) دوو ناحیا:

ریاز و حەویجە.

٦-قەزا کەلار.

پشکا زۆر ژ خەلکێ کەرکووکێ و دانیشتیێن وێ مژیلی چاندنێنە، گەلەك دەخل و دان و برنج و نیسك و نۆك و ماش و پەمبی و کونجیێ دچینن، پشکەك ژی مژیلی شڤانیێ نە، وهندەکێن دی ژی ب کڕین و فرۆشتن و بازرگانیێ ڤە دمژیلن. ژبەر نەبوونا ژێدەرێ مێژوویی یێ تمام دیارکرنا سەردەمێ دروستکرنا باژێرێ کەرکووکێ کارەکێ زۆر ب زەحمەتە. د دوو پەرتووکێن کەڤنێن کلدانی دا باسی ڤی باژێری هاتییە کرن. ل سالا (١٨٦٩) دا مەتران ئەردەشێر پەرتووکەك وەرگێرایە سەر زمانێ تورکی و دانەیەك ژڤێ پەرتووکێ نهۆ ل دێرا کلدانییێن کەرکووکێ دایە ل قەلایێ. لێ پەرتووکا دووێ کو ب ناڤێ (دەنگ و باسێ شەهید و قدیسان)ە سالا (١٨٩١) قەشە پۆلس بێجانی ل باژێرێ لایبزیك گەهاندییە چاپێ.

وەکو دناڤەرۆکا ئەڤان هەردوو پەرتووکان دا دەردکەڤیت پاشایێ ئاشوری سەردناپالی فەرمانا ئاڤاکرنا باژێرێ کەرکووکێ دایە و هزار کەسێن ئاشوری ل باژێرێ نوی دا نێشتەجێکرینە.

ل وی دەمێ کو ئەسکەندەرێ مەکدۆنی ولاتێ میزۆپۆتامیا داگیرکری دەڤەرا کەرکووکێ بوو پارچەیەك ژ ئاخا ئیمبراتۆریەتا وی یا مەزن. پشتی وەغەرکرنا ئەسکەندەری ولاتێ وی دناڤ بەرا سێ فەرماندەیێن لەشکەری هاتە دابەشکرن، باژێرێ کەرکووکێ کەفتە بەر (سلۆکس)ی، ئەڤی فەرماندەری باژێرێ کەڤن رووخاند و سەر ژ نوی دروست کرڤە، شوورەیەکی گەورەی لە دەوری شار تەنی وشێست وپێنج قولە و دەرگەهێن مەزن بۆ دروست کرن، دەرگەهێ سەری ناڤێ وی (دەرگەهێ پاشای) بوو. وەسا دیاردبیت کو (تووتی) چێدبیت هاریکارێ (سلۆکس) ی بیت، وپشتی هینگی یێ بوویە سەرۆکێ باژێری، دسەردەمێ ئەڤی دا کەرکووك گەلەك پێشکەفت وناڤێ بوو (کەرخ -سلۆك ). ل سالا (٢٤٧)ێ پێش زاینی فەراییا باژێرێ کەرکووکێ داگیرکر، ئەڤێ چەندێ زۆر ڤەدکێشا و سالا (٢٢٦)ێ پێش زایینی ئەردەشێر شیا کەرکووکێ ژ فەراییا وەربگریتە ڤە، ب ڤی رەنگی ئەڤ دەڤەرە کەڤتە بن دەستێ ئیرانیان تا سەردەمێ

پەیدابوونا عەرەبان ل ئەڤان هەرێمان ل سەر دەمێ (تەهماسب) قولی خان کو ب ناڤێ (نادرشا) یێ بەرنیاسە، فەلەیەکێ کەرکووکێ دهندەك نڤیسینێن خۆدا ئەڤ زانیارییانە دەرئێخستینە: (ل شەڤا ١٦ ژ کانوونا ئێکێ ل سالا ١٧٣٢ تەهماسبی باژێرێ کەرکووکێ داگیرکر، بەری هەمی تشتان ڤرا جوهیێن باژێرێ ئینا، وگەلەك ژی ئێخسیرکرن، لێ خەلکێ باژێری ب پێکڤە بەرنگاریا ڤێ هێرشێ کرن وبێ وەستیان ل خەباتێ دبەردەوام بوون وسێ دەمژمێرا ڤەکێشا، هەردوو لایەنان زیانێن بێ سنوور دان، وگەلەك کەس ژی هاتنە کوشتن، تەهماسب نەچار بوو باژێری بهێلیت و قەستا گوندێ (ڤۆریە) کو دەمژمێرەکێ ژ باژێری یێ دویر بوو. پشتی رویدانا ئەڤێ کارەساتێ، خەلکێ باژێری جارەکا دی دەست ب ئاڤاکرنا باژێری و دروستکرنا خانیان کرن. رۆژ بۆ رۆژێ باژێر پێشکەفتی و مەزنتر دبوو. باژێرێ کەرکووکێ نهۆ ژ دوو پشکان پێکهاتییە، پشکا ئێکێ بلنداهی یە کو دبێژنێ قەلا، وپشکا دووێ ژی دبێژنێ پانیا ڤۆ ریەیێ. قەلا کەرکووکێ دڤەرەکا ستراتیجی وئاسێ و سەختا ڤێ هەرێمێ یە، وژبەر هندێ بوو هەردەم خۆ ژ هێرشا دۆژمنی پاراستییە. ژکەڤن وەرە فەلەیێن کلدانی ل قەلایێ

دئاكنجی بوون و گەلەك خانووبەرێن جوان تێدا دروست كر بوون. ل وەرزێ بهارێ دا باژێرێ كەركووكێ دیمەنێن رەنگا و رەنگ و قەشەنگ لێ پەیدادبن، ب تایبەت دیمەنێ دەشتا خوارێ وسەرسنگێ قەلایێ گول و شینكاتی وان دخەملینیت. ل قەلا كەركووكێ دا دوو مزگەفتێن زۆر كەڤن هەنە وتانهۆ یێن ماین، ئێك ژوان ناڤێ وی (مزگەفتا ئولۆو)یە ودبێژنێ ژی (مەریەمانە)، ویا دووێ ناڤێ وێ (دانیال پێغەمبەر)ە. فەلە دبێژن: دبنیاتدا ئەڤ دوو مزگەفتە دێرێن دیانان بوون، و گۆڕێ حەنانێ و عەزاری و میشائیلی دناڤ مزگەفتدا دووێ دانە، لێ جوهی دبێژن: دانیال پێغەمبەر دمزگەفتێ دا هاتییە ڤەشارتن.

ئەگەر تەماشەی بیروڕایێن مێژوونڤیسان بكەین دێ بینین بەرۆڤاژی بۆچوونا هەیە، مێژوونڤیس دبێژن: دانیال پێغەمبەر ل (خۆزستان)ێ یێ وەغەركری ول باژێرێ (شووشتەر) یێ هاتییە ڤەشارتن. هەتا نهۆ نەهاتییە زانین كو ل چ سەردەم دا پشكا خوارێ ژ كەركووكێ هاتییە ئاڤاكرن، ژ دەڤێ هندەك كەسانێن پیر هاتییە گوە لێ بوون كو رەنگە ل سالا (١٧٢٩) ێ دا خەلكی خانووبەرێن ل رەخێ خوارێ یێ قەلایێ دروستكربن، بەستا (خاسە) باژێرێ كەركووكێ دكەتە دوو كەرت، قەلا و هندەك ژ تاخێن دی

کەڤتنە لایێ دەستێ چەپێ یێ بەستا (خاسە) کو دبێژنێ رەخێ رێکا سلێمانییێ، لێ لایێ وێ یێ دەستێ ڕاستێ کو نهۆ مەزنترە، لایێ قۆریەیە، ئانکو هەڤلێرێ و بەغدا دبێژنێ، تاخێن رەخێ قەلایێ ئەڤەنە:

(میران ، حەمام موسلیم ، حەمام مەسیح ، ئاغالق ، ئیمام قاسم ، زیندان).

لێ تاخێن رەخێ دی یێ دووێ یێن ب ناڤ و دەنگ ئەڤەنە: (قۆریە، شاترلو، ساری کەهە).

ل کەرکووکێ گەلەك خانووبەرێن جوان و کۆگەو یانە و گازینۆ و قوتابخانەیێن کوڕ و کچ و بارەگاییێن میری و ئاڤ و کارەبا و نەخۆشخانە و باخ و پارك و دام و دەزگاییێن منداڵان و فرۆکخانە و یستگەها شەمەندەفر و تەلەفزیون دهێنە دیتن. هەر دیسان جادەیێن ڕاست و فرەه و رووناك ب تیشکا کارەبێ و خەملاندی ب دارو درەخت ودیمەنێن جوان دهێنە دیتن.

ل باژێرێ کەرکووکێ نزیکێ (١٠٠) سەد جهێن ئایینی ژ مزگەفت و خانەقا و تەکیە و دێر و کلیسە هەنە، جهێن هەرە ب ناڤ و دەنگێن موسلمانان تەکیا نەجیب جەباری و تەکیا تاڵەبانی و خانەقایا سەید ئەحمەد و مزگەفتا (خادم السجادە) نە.

خانیێن کەڤنێن کەرکووکێ ل سەر ئەندازیاریا کەڤنا رۆژهەلاتی هاتینە دروستکرن، حەوشێن مەزن هەنە، و ژدوو هەلاتی هاتینە دروستکرن، حەوشێن مەزن هەنە، و ژدوو نهۆمان پێکدهاتن وب بەر و گێچێ هاتینە دروستکرن، لێ خانیێن نوی ب تایبەتی ل تاخێ شاترلوو ل سەر ئەندازیاریا نوی یێ ئوروپی هاتینە دروست کرن. ل جهێ حەوشێن کەڤن باخچەیێن تێدا هەین. ئاکنجییێن کەرکووکێ ژ نەتەوەییێن کورد و تورکمان و عەرەب پێکهاتینە دگەل هندێ هندەك نەتەوەییێن دی یێن کێم ژی دناڤ دا هەنە وەکو ئەرمەنا، پتریا ئاکنجییان ل کەرکووکێ ژ ئەڤان هۆزو ئیجاخانە:-

شوان ، تالەبانی ، داوودە ، سالەیی ، زەنگەنە ، زەند ، ڕۆژ بەیانی ، پالانی ، کێچ ، لەك ، وەندی ، بەرزنجی ، عەرەب ژی ژ ئەڤان ئیجاخان پێکهاتینە:-

عوبێد ، جبور ، حجێش ، ئەلبوو حەمران ، نەعیم ، کوڕوی ، حەرەب ، عەززە ، سعێدات ، سایح ، بەنوو زەید. تورکمان ژی ژ ئەڤان ئیجاخێن تاترا و بەیات پێکهاتینە. کەرکووك باژێرەکە مەلەڤانیا دناڤ زەریایا گازێ دا دکەت، ژبەر هندێ ژی دبێژنێ باژێرێ (زێرێ رەش). سەنتەرێ سەرەکیێ گازا کەرکووکێ دکەڤیتە بابا گوڕ گوڕ کو دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ باژێرێ کەرکووکێ. رۆژا (١٤)ێ ژ هەیڤا مارس ل سالا

١٩٢٥ پەیمانەك دناڤ بەرا عیراق و کۆمپانیەکا ئینگلیزی د بوارێ دەرئێخستنا گازێ دا هاتە مۆرکرن. ل دویڤ بەندێن ئەڤێ پەیمانێ کۆمپانیا ئینگلیزی بۆ هەیە هەتا ماوێ حەفتێ و پێنج سالیێ سوود و مفای ژبەرهەمێ دەڤەرا گاز لێ وەربگریت. ب مەرجەکی هەمی دام و دەزگا و کەرستێن کو بۆ ڤی پرۆژەی هاتینە خەرجکرن پشتی تمام بوونا وێ دەلیڤێ و ماوەی ب خۆڕایی ببنە مولکێ عیراقێ، پشکا عیراقێ ژی ژ هەر تەننەکا گازێ چوار شلینێن زێرێ بن. ئەوا ل جهێ هەژی گوتنێ ئەڤەیە کو دمێژوویا دەرئێخستنا گازێ دا هندەك کارەسات هاتینە رویدان. ل رۆژا (١٤)ێ ژ چریا ئێکێ ل سالا (١٩٢٧) بیرەك ژ بیرێن گازێ پەقی و دئەنجام دا چەند کەسەك هاتنە کوشتن و لافاوا گازێ ب هەمی جهەکی دا بەلاڤ بوویە. کۆمپانیان وەسان زانی کو باشترە گاز بێی پالاوتن و بژارەکرن بهنێرنە ژ دەرڤە، بۆ ڤێ چەندێ ل سالا ١٩٣٢ێ دوو بۆری یێن گازێ ژ کەرکووکێ هاتنە کێشان بۆ حەدیسە ژ (قەراغ)ێ رووبارێ فوراتێ، ول وێرێ کرنە دوو خەت، ئێك ژوان بۆ باژێرێ تەرابلوسێ شامێ کو درێژاهیا وی (٦١٠) کیلۆمەترە، یێ دووێ بۆ باژێرێ حەیفا کو ب درێژاهیا (٧٤٧) کیلۆمەترە. سالا (١٩٤٨) بۆریا حەیفا هاتە بڕین، ل جهێ وێ ل سالا (١٩٥٢) بۆریەکا

دی هاتە کێشان بۆ باژێرێ بانیاس ل سوریایێ.

دیمەنێ کەرکووکێ دشەڤ دا گەلەکێ جوان و نایابە، رووناهی ژ ئاگرێ مەزنێ بۆرییێن گازێ دهێتە دەرێ، ئەڤ ئاگرە یێ نەمرو هەمیشەیی یە.

مێژوو ب سەردا هات و کارەساتێن باب و باپیرێن مە ڤەدگێریت، باژێر وەکو بویکەکا خەملاندی و جوان دناڤ رووناهیا نازکرا هاتییە پێچان، ئەگەر ل سەر لووتکا چیای و گوند و باژێرێن دی یێن کوردستانێ نەورۆزێ چرا هەبن وببنە چراخان، هەمی شەڤێن باژێرێ کەرکووکێ نەورۆزن.

# گولا مێخەك

ناڤێ مێخەك ب زاراڤێ خویێ لاتینی (داننەس کارێوپلیسیا) یە، و (کارێوپلیسیا) ب تنێ واتا وێ: سەر ب خێزانێ، و (داننەس) ژی واتا وێ: مێخەك، کو هەمی ب پێکڤە دبیتە: سەرخێزانا مێخەك یان خێزانا مێخەك.

شوینوارێ بنەڕەتێ ئەڤی ڕووەکی چیایێن نورماندی و مێرەیە، و ژوێرێ ب جیهانێ بەلاڤ بوویە، گولا مێخەك ل باخچە و باخچەڤانێدا گرنگترین گولە. گولەکا جوان و رێك وپێك وب دیمەن و بێهنەکا خۆش ودلڤەکەر هەیە، ودشیاندایە ب دەستك بهێتە پێشکێش کرن، یان دگولدانی دا بهێتە دانان، وماوەیەکێ زۆر ب گەشی وجوانی دمینیت، مێخەك ڕووەکەکە ئەگەر مەبڤێت ژلایێ ئەکادیمی بنیاسین و ژ ڕووەکێن دی جودا بکەین، دێ ب ڤی جۆری بێژین:

١-قەد و بالایێ مێخەکێ یێ باریك و زراڤە، وبەرگریا شکاندن و چەماندنێ ناکەت.

٢- دبهارێدا گولان ددەت ول دەست پێکا هەیڤا چریا دووێ هەتا مایسێ دمینیت.

٣-گولێن وێ کت کتن، وهەر گولەکێ پێنج پەڕێن رەنگین هەنە، وجۆرەکێ دی هەیە گولێن وێ کت کت نینن، دپڕن و پەڕێن وێ ژ پێنجان پترن ل دویڤ جۆرێ گولێ.

٤-بەلگێن وێ دستویرن و ددرێژن و دکەسکن.

## مێخەك د چ زەڤی دا دهێتە چاندن وچەوا دهێتە زبل کرن؟

مێخەك دهەمی جۆرێن ئاخێدا دهێتە چاندن، ڤێجا ئەڤ ئاخە یان رەق وتوند بیت. . یان ژی یا نەرم وپۆخ بیت، ب مەرجەکی زبل کرنا زەڤیێ یاب هێز و باش بیت. لێ هندی ئاخ نەرمترو قەوزارتر بیت زبل کر ن دێ چاکتر وباشتر بیت و زویتر گول دێ گەشێ کەتن، (ژەندەل)ێ ڕووەکناس یێ ب ناڤ و دەنگ ل سالا (١٩٣٨)ێ دا تاقیکرنەك دەربارەی هۆیێ شەقبوونا کاسا گولا مێخەکێ سازکر، دەرکەت ژ ئەگەرێ زۆر زبل کرنا وی و زۆر مێشتنا فۆسفۆری.

هەر دڤی بواری دا (کە نەرس بلیهارت)ێ رووەکناسێ ناڤدار ل سالا (١٩٣٢)دا

تاقیکرنەکا دی سازکر و سەلماند کو هۆیێ سەرەکی زێدە مێشتنا باێرو ژینیە، وئەو ژی ساخکرڤە کو تەمەت کەچکەکێ چایێ ژ زبلێ خوینا هشکری تێرا برەیەکێ ژ گولا مێخێ دکەت و گول یا گەشێ دکەت وپێ مەزن دبیت.

لێ چاکترین زبل. زبلێ تەویلە و زبلێ کیمیایی یە وب تایبەتی زبلێ نیترۆ فوسکا کو هەرسێ سرۆشتیێن نایترۆژین و فۆسفۆرو پۆتاسیوم تێدانە و زۆر ب کارتێکرنن.

هەر ئینجایەکا گولا مێخێ (١٥ - ٢٠) گم زبلی دڤێن، باشترین دەمێ زبل کرنێ پاییزەکا درەنگە، کو ل وی دەمی گۆپکە و پشکۆژان ددەت.

## مێخەك چەوا دهێتە ئاڤدان؟

نابیت بهێلین ئەڤ گولە تێهنی ببیت هەر دیسان نابیت تێر شەە ژی ببیت، چونکە ئاڤا زۆر باشیێن ئاخێ دێ بەرزەکەت و دێ کون و دەرزێن ئاخێ گریت و ئەو هەوایێ تێدا دێ دەرئێخیت وئەگەر هەوا ژی تێدا نەما ئەو رە و ریشالێن وێ ژبەر نەبوونا ئۆکسژینی دخەندقن وژکار دکەڤن و نەشێن چ بمێژن و رووەك بەرەڤ لاوازیێ دچیت ودمریت. ڤێجا ژبەر هندێ ئاڤدانێ پەیوەندی ب ئەڤان خالێن خوارێ ڤە هەیە:-

١- **جۆرێ ئاخێ:** ئاخا نەرم پۆخ پتر ژ ئاخا رەق ئاف دڤێت، چونكە رووەكی زوی زوی ئاف دڤێت، هەروەسا ل وان ئاخان ئاف زویكا هەلمێ ددەت.

٢- **جۆرێ هلدانێ:** دەمێ رووەك گولێ ددەت نابیت بهێتە ئاڤدان، ئەگەر بهێتە ئاڤدان دێ گولان وەرینیت، ڤێجا ئەگەر مە بڤێت بزانین كانێ رووەك یێ تێهنییە یان نە. پێدڤییە ئاخا وێ ب هەلكولین و سەحكەینێ وئەڤ هەلكولینە ب ئەندازا

( ١,٥) گرێ بیت. وئەگەر ئاخ یا هشك بوو ئەو پێدڤی ئاڤدانێ هەیە.

## گول مێخەك چەوا زۆر دبیت؟

گول مێخەك ب دوو رێكان دهێتە زێدەكرن:

**١- ب تۆڤی:** باشترین دەمێ تۆڤكرنێ ژی هەیڤا ئادارێیە.

**٢- ب قەلەم چاندنێ:** باشترین دەم بۆ ڤی جۆرێ زێدەكرنێ هەیڤا شواتێیە.

جۆرێ ئێكێ یێ چاندێ گەلەك بەلاڤ نینە، وئەگەر مە بڤێت جۆرێ گولەكێ یێ نوی بەلاڤ بكەین دێ ب تۆڤی زێدەكەین و گولێن باش و مەزن دێ پەیدابن، ڤێجا پێدڤییە تۆڤێ وی یێ پاقژ بیت ویێ بژارتی بیت و ئەو زەڤیا بۆ دهێتە ئامادەكرن پێدڤێیە یا نەرم و پاقژ و ب زبل بیت و پشتی چاندنێ تۆڤ نابیت ژ (٣-٤) ملیمەتران زێدەتربیت وئاف باشتر لێ بهێتە رەشاندن هەتا تۆڤ شێن ببیت، دەمی (٤-٦) بەلگێن كەسك ژێ دەردكەڤن هینگێ دێ هێنە ڤەگوهاستن بۆ جهێن دی، لێ پێدڤییە ئەو جهێ بۆ دهێتە ڤەگوهاستن یێ بەرهەتاڤ بیت ونەل بەر سیبەرێ بیت. دگەل هندێ ژی ل دویڤ ڤێ ئەزموونا كو زانایێ ناڤدار (هوللی) كری هندەك جۆر هەنە ئەگەر ل بەر سیبەرێ بهێتە چاندن ژ كلۆرۆفیلی دێ بهێزتربیت.

مێخەك چونكو تایێ وێ لاوازە ویێ راستە ناڕاوەستیت و دچەمیێت، پێدڤییە چەپەری بۆ دانین داكو نەهێتە چەماندن وبهێتە پاراستن وپێدڤییە ڤان خالان ل بەرچاڤ وەرگرین:-

١-هەر مالكەك دێ تایەكی یان چلیەكێ (٥٠) سانتیمەتری دێ هێنە چكلاندن و ددویڤدا دەزی دێ پێڤە هێتە گرێدان و ژ چەماندن و شكاندنێ دێ دهێتە پاراستن.

٢- یان سێ تایێن (٥٠) سانتیمەتری ل دەوروبەرێن مالكەكێ دێ هێنە چكلاندن ل شوینا دەزی تێلێ تێ دئالینن. ب مەرجەكی ئێك ژوان ژناڤ قەدی تایی بەرەڤ خوارتر ویێ دووێ ژ نیڤێ بەرەڤ خوارتر و مالك دكەڤیتە دناڤ بەرا ڤی پەرژانێدا (٣ -٤)، وسێ چوار بەلگێن سەری نەبیت نابیت چ تشتێن دی پێڤە. بمینیت دەمێ قەلەم ژێ دهێنە بڕین دڤێت ل بن گرێكا بهێنە بڕین و سەر تایێن وان بێنە قوساندن، ئەگەر نە هەلم باش دەرناكەڤیت.

پشتی هینگێ کو قەلەمان دبڕین دێ ب ئەڤی رەنگێ خوارێ چنین:

١-پێدڤییە ئاخ یا نەرم بیت.

٢-پێدڤییە ئاخ ب ئەندازەیا (٢سم) بهێتە کویرکرن.

٣- پێدڤییە قەلەم هەر ئێك ژ یێ دی (٣سم) دویربیت وب رێز بهێتە چاندن.

٤-پێدڤییە هەر رێزەك ژ یادی (٣سم) دویر بیت.

٥- پشتی چاندنا قەلەمان پێدڤییە بهێتە ئاڤدان وب چ رەنگان نەمیننە تێهنی وپشتی (٦-٧) حەفتیان قەلەم دێ گەشێ و دێ دەست ب ڕە داکوتانێ کەن و دێ بۆجهێ پێدڤی هێنە ڤەگوهاستن و هەر ئێك ژ یێن دی (٣٠-٤٠) سم دویرتر دێ هێنە چاندن.

# پێڕست